2007-12-04

# پێرست

## حیكایەتی سێ هاوڕێ

یەكێ بوو یەكێ نەبوو، جگە لە خوا كەس نەبوو. سێ هاوڕێ هەبوون كە هەر سێكیان بەدڵ عاشقی بێقەراری كیژە تاقانەكەی پاشا بوون كە كیژێكی بە راستی زۆر جوان بوو. لێ هیچ كامیان ئەم نهێنییەی بەوی دی نەگوتبوو و لە دڵی خۆیدا پاراستبووی. تا رۆژێك ئەم سێ هاوڕێیە پێكەوە دادەنیشن‌و بەدەم قسەوە لە هەموو ئاوازێك دەدەن. كە باس هاتە سەر زەماوەند گێڕان‌و ژن هێنان هەر سێكیان گوتیان كاتی ئەوە هاتووە زەماوەند بكەن‌و هاوسەری خۆ هەڵبژێرن، بەڵام دەبێ جارێ پارە كۆبكەنەوەو پاشان بچنە خوازبێنی. بۆیە هەر سێ هاوڕێكە بۆ ئەوەی پارەیەك بە دەست بێنن‌و دەوڵەمەند بن, لێبڕان هەر كەسەو بە دووی بەخت‌و ناوچەوانی خۆیدا روو بكاتە شوێنێك. قەول‌و قەراریان كرد كە پاش دووساڵ جارێكی دی لە هەمان شوێندا یەكدی بدینن. ئیدی هەر كەسەو باروبنەی سەفەری ئامادە كردو بەر یێ خۆیدا رۆیی. دوو ساڵ بووری‌و هاوڕێی یەكەم كە لەم ماوەیەدا توانی بووی دوو سەد لیرە كۆبكاتەوە، لەم كاتەدا بڕیاریدا كە بۆ شارەكەی خۆیان بگەڕێتەوەو بچێتە ئەو شوێنەی كە قەول‌و قەراریان دابوو یەكتری لێ بدینن. بەڵام لە كاتێكا كە بۆ شارەكەی خۆیان دەگەڕایەوە، رۆژێ لە رێگەدا گەییە شارێك گوێی لێ بوو كابرایەكی بازرگان هاوار دەكات:

- ئاوێنەیەك بۆ فرۆشتن، ئاوێنەیەك بە دوو سەد لیرە. كوڕە كە گوێی لەو بانگەوازە بوو، بەرەو دەنگەكە رۆیی‌و لە كابرای فرۆشیاری پرسی:
- بۆچی نرخی ئەم ئاوێنەیە ئەوەندە گرانە؟

وەڵامی دایەوە:

- چونكە ئاوێنەیەكی ئاسایی نییەو هەر كاتێ بڕوانیتە ئەم ئاوێنەیە هەر شتێكت بوێ یەكسەر دەردەكەوێ، لەبەر ئەمە ئەم ئاوێنەیە ئەوەندە گرانە: كە كوڕەی لاو گوێی لەو قسەیە بوو، یەكسەر شازادە خانمی خۆشەویستی وەبیرهاتەوەو ئاوێنە سیحراوییەكەی كڕی‌و دیسان كەوتەوە رێ.

ئێستا با بێینە لای هاوڕێی دووەم: ئەویش كە لە ماوەی ئەم دوو ساڵەدا دوو سەدو بیست لیرەی كۆكردبووەوە، كە دوو ساڵەكە تەواو بوو بچێ بۆ قەرارگاكەیان. ئیدی كەوتەڕێ. لە رێگە گەییە بازاڕێك، كە چووە بازاڕەكەوە گوێی لێ بوو بازرگانێك هاوار دەكات:

- ئەم قاڵییە بە دوو سەدو بیست لیرە... ئەم قالییە.. كوڕەی لاو كە زۆری پێ سەیر بوو، چووە لای بازرگانەكەو پرسی:
- هاپۆ، ئەم قالییە بۆ ئەوەندە گرانە؟

بازرگانەكە وەڵامی دایەوە:

- چونکە قالییەکی ئاسایی نییە. هەر کاتێ لەسەر ئەم قالییە دابنیشی، یەکسەر بە ئاسماندا دەچیو وەکو باڵندەیەکی تیژباڵ بۆ هەر شوێنێکی دنیات بوێ دەتبات! لەبەر ئەمەیە نرخی ئەم قالییە گرانە. ئیدی هاوڕێی دووەمیش پارەکەی لە کیسە دەرهێناو قالییە باڵدارەکەی کڕیو کەوتەوە ڕێ.

هاوڕێی سێیەمیش کە لە ماوەی ئەم دوو ساڵەدا دوو سەد لیرەی کۆکردبووەوە، بەرەو شارەکەی خۆی وەڕێکەوت... لە ڕێگەدا تووشی کابرایەك بوو کە تاقە لیمۆیەکی لەبەردەم خۆیدا دانا بوو و داوای نرخێکی زۆری لێدەکرد. کوڕەی لاو کە زۆری پێ سەیر بوو، هۆی ئەم گرانییەی لە کابرا پرسی، کابرا وەڵامی دایەوە:

- کوڕم ئەمە لیمۆیەکی ئاسایی نییە، بەڵکو لیمۆیەکی جادووییە. هەر کەسێك ئەم لیمۆیە قاژ بکاتو پاشان بۆنی بکات، تا کۆتایی تەمەنی نەخۆش ناکەوێ.

بەمجۆرە هاوڕێی سێیەمیش هەموو پارەکەی داو لیمۆ جادوییەکەی کڕی.

سەرەنجام کاتێ ئەم سێ هاوڕێیە لە وەختی خۆیدا گەییشتنەوە قەرارگاکەیان بە خۆشحاڵییەوە لە دەوری یەکدی دانیشتن. هاوڕێی یەکەم گوتی:

ئێ هاوڕێیان با بزانین هەر یەکێکمان چی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەوە. من دوو سەد لیرەم هەبوو، بەلاّم لە ڕێگەدا دام بەم ئاوێنە جادووییەو خەسێتی ئەم ئاوێنەیە ئەوەیە کە هەر کاتێ تێی بڕوانم ئارەزووی دیتنی هەر کەسێك بکەم یەکسەر لە ئاوێنەکەدا دەیبینم.

هاوڕێی دووەم گوتی:

- من دوو سەدو بیست لیرەم هەبوو، بەلاّم لە ڕێگەدا لام دایە بازاڕێكو هەرچی پارەم هەبوو دام بەم قالییە باڵدارە. خەسێتی ئەم قالییە ئەمەیە کە هەر کاتێ لەسەری دانیشمو ئارەزووی هەر شوێنێ بکەم، وەکو باڵدار دەفڕێو بۆ ئەو شوێنەم دەباتو لە هەر کوێم بوێ لەوێندەر دەنیشێتەوە.

ئەنجام هاوڕێی سێیەم گوتی:

- منیش لەم دوو ساڵەدا توانیم دوو سەد لیرە کۆبکەمەوە. بەلاّم هەر هەموویم دا بەم لیمۆیە کە میوەیەکی جادووییە، خەسێتەکەشی ئەمەیە کە هەر نەخۆشێك بۆنی بکات یەکسەر چاك دەبێتەوەو عەمری درێژ دەبێت.

پاش ئەوەی ماوەیەك دانیشتنو باسی سەربورو بەسەرهاتی خۆیان کرد. هاوڕێیانی دووەمو سێیەم بە هاوڕێی یەکەمیان گوت:

- باشە ئێستا ئاوێنەکەت بێنە پێشەوەو تا بزانین هەر یەکەمان چی تێدا دەبینێ.

بەلاّم کاتێ هەر سێکیان لە دڵی خۆدا ئارەزووی دیتنی خۆشەویستەکەیان، واتە شازادە خانم، کردبوو لە پڕ وێنەی شازادە خانم کە لەسەر تەختە خەوەکەی خەوتبوو، دەرکەوت. بەلاّم زۆر سەیر بوو وا دەهاتە بەرچاو کە شازادە خانم زۆر نەخۆشە و مەرگی نزیکە. لەم کاتەدا کە لێکدی حاڵی و بە رازی دڵی یەکتریان زانی، لە کاتێکا یەك لە یەك خەمبار تر بوو بوون. بە پەلە بەرەو قالییە باڵدارەکە چوونو گوتیان:

- ئێستا دەبێ داوا لەم قالییە بکەین کە بمانبات بۆ کۆشکی پاشا، بۆ لای شازادە خانم!

بەم جۆرە کاتێ هەرسێکیان لەسەر قالییەکە دانیشتن، قالییەکە بە پەلەو بە نەرمی باڵندەیەك لە ئەرز بەرز بووەوەو لە ماوەیەکی کورتدا گەییە کۆشکی پاشاو هاتە خوارەوە. کاتێ چوونە ناو کۆشکەکەوە سەیریان کرد ئاوێنەکە درۆی لەگەڵ نەکردوون و شازادە خانمی خۆشەویستیان بەڕاستی نەخۆشەو لە نێو جێگەدا کەوتووەو نزیکە مەرگە. لەم کاتەدا دوو هاوڕێی یەکەم بە هاوڕێی سێیەمیان گوت:

- دەی، ئێستا نۆرەی لیمۆ جادووییەکەی تۆیە. خێراکەو لیمۆکە قاژ بکە تا شازادە خانم بۆنی بکات، بەڵکو بتوانین زیندووی بکەینەوە.

هاوڕێی سێیەم دەمودەست لیمۆ جادووییەکەی لە ناوەڕاستەوە شەق کردو لەبەر لووتی شازادە خانمدا رایگرت. چەند چرکەیەکی نەبرد کە لە پڕ بە حوکمی کاری جادوویی ئەم لیمۆیە، شازادە خانم-ی نەخۆش چاوی کردەوەو حاڵی هاتەوە جێ.

بەڵام کاتێ ئەم سێ هاوڕێیە دیتیان کە حاڵی شازادە خانم باش بووەو لە سەلامەتی ئەو دڵنیا بوون، چونکە هەرسێکیان ئاشقی بێقەراری شازادە خانم بوون، هەر کەسەو دەیویست شازادە خانم ببێ بە هاوسەری ئەو، لەسەر ئەمە لێیان بوو بە شەڕو هەڵڵا. شازادە خانمیش واقی وڕما بوو و نەیدەزانی کامیان هەڵبژێرێ.

هاوڕێی یەکەم دەیگوت:

- ئەگەر ئاوێنە جادووییەکەی من نەبووایە چۆن دەتانزانی شازادە خانم نەخۆشە؟

دووەم دەیگوت:

- ئەگەر قالییە باڵدارەکەی من نەبوایە ئێوە چۆن دەتانتوانی بەو خێراییە خۆتان بگەیەننە ئێرەو لە ئەنجامدا نەجاتی بدەن.

سێیەم دەیگوت:

- بەڵام بەبێ لیمۆ جادووییەکەی من، ئێوە هەرگیز نەتاندەتوانی شازادە خانم زیندوو بکەنەوە بەڵام پاش ماوەیەك شەڕو هەڵڵا کە هەر سێ هاوڕێ نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك و نەیاندەزانی کێیان بۆ هاوسەری شازادە خانم لە پێشترن، چوونە لای قازی و هاوڕێی یەکەم گوتی:

- ئەم ئاوێنە جادووییەی من بوو کە شازادە خانمی نیشاندا، کەواتە دەبێ شازادە خانم بۆ من بێ!

دووەم گوتی:

- بە هۆی قالییە باڵدارەکەی منەوە بوو کە بەو خێراییە گەیشتینە ئەوێندەر، کەواتە هەقە شازادە خانم بۆ من بێ!

سێیەم گوتی:

- بەڵام ئەگەر لیمۆ جادووییەکەی من نەبووایە، ئێستا شازادە خانم لە ژێر خاکدا دەبوو.

بە هەر حاڵ هەر یەکەیان دەیویست ئەوە بسەلمێنێ کە شازادە خانم دەبێ هی ئەو بێ.

لەم کاتەدا قازی رووی کردە هاوڕێی یەکەمو گوتی:

- کوڕم چەندت پارە بەم ئاوێنەیە داوە؟

وەڵامی دایەوە:

- دوو سەد لیرە.

قازی دوو سەد لیرەی بە کوڕی یەکەمداو ئەوجا رووی کردە هاوڕێی دووەم:

- کوڕم تۆ چەندت بەم قالییە داوە؟

کوڕە وەڵامی دایەوە:

- دوو سەدو بیست لیرە قوربان.

قازی دەستووری داو دوو سەدو بیست لیرەیان بە خودان قالییەکەدا.

بەڵام کە نۆرەی هاوڕێی سێیەم هات، قازی رووی تێکردو گوتی:

- کوڕم شازادە خانم دەبێ بەهی تۆ، چونکە لە دوانەکەی دی فیداکارتری، لیمۆ جادووییەکەت شەق کردو ئیدی ئەو جۆرە لیمۆیەت دەست ناکەوێتەوە!

بەم پێیە شازادە خانم بوو بە هاوسەری هاوڕێی سێیەمو سەرئەنجام هاوڕێی سێیەم بەو ئاواتە گەیی کە شایانی بوو.

## حیكایەتی بازرگان و سێ لیرەكەی

هەبوو نەبوو بازرگانێكی زۆر زەنگین هەبوو، لێ ڕۆژێك هات ئەم بازرگانە دەوڵەمەندە بە تەواوی نابووت بوو، لە دارای دنیادا تەنیا سێ لیرەی بۆ مایەوە. خولاسە هێندە هەژارو بێنەواو بەدبەخت بوو بوو، بیری دەكردەوە دەبێ بەو سێ لیرەیە چ بكات. هێندەی لە توانادا بوو قەناعەتی دەكرد نە هیچی دەخواردو نە هیچی دەخواردەوە، لێ لەگەڵ ئەمەشدا ئەو وەزعو حاڵەی خۆی لەبەر گران بوو، هەستی بە خەمو پەژارە دەكردو شەرمی دەكردو قسەو قسەلۆكی خەڵكی لەبەر گران بوو، تا ڕۆژێ بڕیاریدا كە ژنو مناڵەكانی بە تەمای خودا بەجێ بهێڵێ‌و لە شاری هەڵێ، پاش ئەو بڕیارە سێ لیرەكەی لەبەركی ناو لە ماڵ‌و لە شار هاتە دەرێ.

ئیدی ملی ڕێگەی گرت‌و بە خۆیشی نەیدەزانی كێوە دەچێت، تا شەوی بەسەردا هات‌و گەییە بێشەیەك. ئەم بێشەیە زۆر تاریك‌و سامناك بوو، بازرگانەكە لە دڵی خۆیدا كەمێك ترسا، بەلام لەم كاتەدا چاوی بە قەلەندەرێك كەوت كە لە قەراخ بێشەكەدا دانیشتبوو. بازرگانەكە سلاوی لە كابرای قەلەندەر كرد. قەلەندەر لێی پرسی:

- كوڕم بەم شەوە، لەم بێشەیەدا، لە چ دەگەڕێی؟

بازرگان وەلامی دایەوە:

- باوكە: من عەودالی چارەنووسێكی باشترم و هەر بەونیازەش گەییومەتە ئێرە.

پاشان بیری كردەوە كە حەقیقەتی مەسەلەكە بە كابرای قەلەندەر بڵێ باشترە, بۆیە گوتی:

– من ڕۆژێ لە ڕۆژان بازرگانێكی زۆر دەوڵەمەندو بەختەوەر بووم, بەلام ئێستا بەخت و یەغبال پشتی تێ كردووم و لەو هەموو سەروەت وسامانە تەنیا سێ لیرەم بۆ ماتەوە.

قەلەندەر گوتی:

– باشە, پێویست ناكات لەوەی پتر خەمی رابردووان بخۆی, تۆ ئەگەر ئەو سێ لیرەیە بدەیتە من, لەجیاتی ئەوە سێ پەندت فێر دەكەم.

بازرگانەكە بۆ چەند ساتێك لە فكران ڕاچوو، لە دڵی خۆیدا گوتی ئەگەر ئەم سەودایە لەگەڵ كابرای قەلەندەردا بكات رەنگە ترسەكەی هەندێ برەوێتەوە، بۆیە لیرەكانی لەبەركی دەرهێناو دای بە كابرای قەلەندەر.

كابرای قەلەندەر كە هەموو لیرەكانی لێ وەرگرت گوتی:

- كوڕی خۆم، باش گوێ بگرەو ئەم سێ پەندە لەبەر بكە:
- ترس برای مەرگە.
- ماشوقە دەبێ لە چاوی ئاشقەوە سەیر بكرێ.
- لە داوەریدا نابێ پەلە بكرێ..

که کابرای قەلەندەر قسەکانی تەواو کرد، لەپڕ ون بوو و بازرگانەکەی بە تەنیا جێهێشت. کە ڕۆژ بووەوە کابرای بازرگان دووبارە کەوتەوە ڕێ‌و بەدەم ڕێکردنەوە گەییە سێڕیانێك. لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە کە بە کامە ڕێگەدا بڕوات... ئەنجام بە خۆی گوت پیاو لە هەر کارێکدا ڕێگەی ناوەڕاست بگرێ باشترە. بەمجۆرە خۆی بە ڕێگەی ناوەڕاستدا کردو ڕۆیی. ئەم ڕێگەیە دەگەییە بناری چیایەکی زۆر بەرز، کاتێ کابرای بازرگان گەییە چیایەکە سەیری کرد ئەشکەوتێکی تاریك‌و بچکۆلە لە بنی چیایەکەدا هەیە.. کابرای بازرگان کە زۆر ترسا بوو نەیدەزانی چ بکات ئایا بچێتە ناو ئەشکەوتەکە یان نا، لە پڕ ئەو پەندەی کابرای قەلەندەری بیرکەوتەوە کە گوتبووی: "ترس برای مەرگە"و خۆی بە ئەشکەوتەکەدا کرد.

ئەشکەوتەکە زۆر تاریك‌و ترسناك بوو، کابرای بازرگان بەرپێی خۆی نەدەبینی. لە کاتێکا بە کوێرە کوێرو لەپەکوتێ دەچووە پێشێ، لەپڕ چاوی بە کلاوڕۆژنەیەك کەوت کە ڕووناکی لێوە دەهاتە ژوورێ، بۆیە بەرەو ڕووناکییەکە ڕۆیی، کە گەییەت ئەوێندەر دەرگایەکی بینی کە بەسەر باخێکدا دەکرایەوە. ئەم باخە زۆر جوان‌و سەوزو دڵگیر بوو، تەیروتوو لەوێندەر سەرگەرمی نەغمەخوانی بوون. بەمجۆرە کابرای بازرگان خۆی وەباخەکەدا کرد. چونکە زۆر شەکەت بوو، لە قەراخی ڕوبارێکدا کە ئاوێکی فێنك‌و زوڵاڵی پێدا دەڕۆیی، دانیشت. لێ کە ئاوڕی دایەوە لەوبەری ڕووبارەکەوە چاوی بە جانەوەرێکی سەیری زۆر ناحەزو سامناك کەوت کە بەرزی بالای بە ئەندازەی بالای مرۆڤێك بوو، کابرای بازرگان زۆر ترساو بەسەرسامی دەیڕوانییە ئەم گووراوە سەیرە، لێ لەم کاتەدا کچۆڵەیەکی زۆر جوان کە جلێکی سپی وەکو جلکی بووکانی لەبەربوو، لە نزیکی ئەو شوێنەوە کە کابرای بازرگانی لێ دانیشتبوو بە دیارکەوت‌و لێی پرسی:

– به دڵی تۆ کێمان جوانترین، ئەو قورباقە دزێوەی کە لەوێ دانیشتووە یان من؟

بازرگانەکە هەڵوەستەیەکی کرد، دیسان قسەی کابرای قەلەندەری بیرکەوتەوەو گوتی:

– ماشوقە دەبێ لە چاوی ئاشقەوە سەیر بکرێ.

لەم کاتەدا لە پڕ دەنگێکی سامناکی هەورە تریشقە ئاسای هاتە گوێ‌و بازرگانەکە بەسەرسامییەوە بینی کە ئەو جانەوەرە سامناکە ون بوو و ڕێك لە هەمان شوێندا کە پێشتر کچۆڵەکەی لێ وەستا بوو بارێك زێڕو تەلا دانراوە، بازرگانەکە یەکسەر حاڵی بوو کە ئەو ڕستەیەی گوتویەتی، تەلیسمێك بووەو بووەتە مایەی ئەم ڕووداوە. ئیدی بەسەرسامی‌و خۆشحاڵییەوە تا توانی لەو بارە زێڕەی هەڵگرت‌و بەرەو شارەکەی خۆی وەڕێ کەوت. لێ بەدەم ڕێوە لە دوورەوە چاوی بە سوارێك کەوت کە بە چوارناڵە بەرەو لای ئەو دەهات.

کابرای بازرگان ترسی لێ نیشتبوو و نەیدەزانی چ بکات‌و پێی وابوو هەبێ‌و نەبێ ئەو کابرایە ڕێگرە، لێ کاتێ کە سوارەکە لێی نزیك بووەوە بۆی دەرکەوت کە ترسەکەی نابەجێ بووەو ئەو سوارە کوڕی هاوسێکەیان بوو، بۆیە کابرای بازرگان بە خۆشحاڵییەوە هەواڵی ژن‌و مناڵەکانی، کە ماوەیەك بوو لێیان بێ خەبەر بوو، پرسی، سوارەکە وەڵامی دایەوە:

– ئاھ چما نازانی؟ ماوەیەکی زۆرە ژنەکەت تۆی فەرامۆش کردووەو شووی بە پیاوێکی دیکە کردووەتەوەو منالّەکانتی بەرەڵلا کردووەو ئیدی گەڕانەوەی تۆ بۆ شار بێفایدەیە!

کابرای بازرگان کە گوێی لەم خەبەرە بوو راچەڵەکی و زۆر خەمبار بوو، لێ ئەمجارەش سێیەمین پەندی کابرای قەلەندەری بیر کەوتەوە کە گوتبووی: "لە داوەریدا نابێ پەلە بکرێ...".

بۆیە بێ ئەوەی نائومێد بێ، بە خێرایی بەرەو شار وەڕێ کەوت. کە گەیشتەوە شار لە پێشا چوو بۆ ماڵی خوشکەکەی تا دڵنیا ببێ کە ئاخۆ قسەی کابرای سوار دروستە یان نا؟

لێ کاتێ ئەو باسەی لەگەڵ خوشکەکەیدا کردەوە، خوشکەکەی بە نارەحەتی گوتی:

– ئاھ... ئەم قسانە راست نین، هاوسەری داماوو وەفاداری تۆ کە تۆ بە کۆشێ منداڵەوە بەجێت هێشت مەجبوور بوو بە دارو چیلکەو جل شۆری ماڵان، منالّەکانت بەخێو بکات. بەڵام کوڕی هاوسێکەتان کە زۆری دڵ بەوەوە بوو ئەو بخوازێ، بۆیە ئەو درۆیەی هەڵبەستووە کە شووی بە پیاوێکی دی کردووەتەوە!

بازرگانەکە بە بیستنی ئەم قسەیە زۆر خۆشحاڵ بوو، چووەوە بۆ لای هاوسەرە میهرەبانەکەی و کە گەییشتەوە ماڵێ هەموو ئەو شتانەی بۆ ژنەکەی گێڕایەوە کە بەسەری هاتبوون و پاشان بەو زێڕانەی کە دەستی کەوتبوو، دەستی بە ژیانێکی ئاسوودە کردو بەمجۆرە بەدبەختییەکانیان تەواو بوو و ساڵانێکی دوورو درێژ بە خۆشی ژیان.

## چی بووم، چیم، دەبم بە چی؟

یەکێ بوو یەکێ نەبوو، جگە لە خوا کەس نەبوو. پاشایەك هەبوو کە ساڵانێك بوو بە عەزرەتی فەرزەندێکەوە بوو تا ئاقیبەت رۆژێ ژنەکەی کیژێکی بوو و پاشا بوو بە خاوەنی ئەولادو خەمو خەفەتی فەرامۆش کردو ئەم کیژە چکۆلەیەی زۆر خۆش دەویست. لێ زۆری نەبرد کە کەیف‌و شادی پاشاو شابانۆ بوو بە خەمو پەژارە، چونکە ئەم کیژە تا گەورەو گەورەتر دەبوو برین‌و زامی قول دەکەوتنە بەدەنی. بۆیە شاو شابانۆ کە ئەم وەزعو حاڵەیان بینی، خەریك بوو لە داخانا دیق بکەن‌و هەرچی حەکیم‌و لوقمانی وڵات هەبوو هێنایاننە سەر کیژە، بەڵام هەر چییان دەکرد نەیاندەتوانی برینەکانی شازادەخانم ساڕێژ بکەنەوەو خولاسە لە هەر دەرو دیوارێکیان دەدا هیچ دەرمانێك بۆ دەردی شازادەخانم نەدەدۆزرایەوە. ئیدی شای داماو کە لە چارەسەری برینەکانی شازادەخانمی شەنگوڵ نائومێد بوو بوو فەرمانی دابوو کە هەمیشە جل‌و بەرگی زێڕ باف‌و جەواهیر نیشانی لەبەر بکرێ تا کەس بەدەنی گرۆی‌و زامەکانی نەبینێ. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەموو خەڵکی شار بە حاڵی بێ حاڵی شازادەخانمیان دەزانی‌و زۆری بۆ بە پەرۆش بوون.

ساڵان تێپەڕی، تا رۆژێك ژنێکی جادووبازی حیلەباز هاتبووە ئەم شارە، کە سەربووری شازادەخانمی ژنەوتبوو، کیسەیەکی هەڵگرت بوو و پڕی کردبوو لە شتی بێ کەڵك‌و چوو بوو بۆ دەوروبەری کۆشکی شاو کە نزیك بوو بووەوە کەوتبووە بانگ‌و های هاو: — هەتوان، هەتوانی دەردانم پێیە، هەتوانی چارەی نەخۆشیم پێیە. کە ئەم بانگ‌و هاوارە گەییە گوێی شازادەخانم، دەستووری دا ژنەیان هێنایە ژووریۆ ئەوجا لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ لای بابی، یانی بۆ لای پاشا، پاشا کە بە مەسەلەکەی زانی، بە ژنەی گووت: — ئەگەر بتوانی برینی کیژەکەم چاك بکەیتەوە، ئەوا خەڵاتێکی چاکت دەدەمێ: — لێ ژنەی جادووباز وەڵامی دایەوە: بە مەرجێ رازیم ئەم کارە بکەم کە هەر کارێکم داوا کرد ئەنجام بدرێو هیچ جۆرە پرسیارێکم لێ نەکەن: کە پاشا ئەم مەرجەی قەبووڵ کرد، ئەوسا ژنە گوتی: — یەکێك لە ژوورەکانی کۆشك بۆ من‌و شازادەخانم ئامادە بکەن کە جگە لەم دوو کەسە کەس هەقی ئەوەی نەبێ بێتە ژوورەوە. من لە زەرفی دوو رۆژاندا بە زەبری دەرمانی تایبەتی زامەکانی بەدەنی شازادەخانم ساڕێژ دەکەمو لە رۆژی سێیەمدا هیچ شوێنەوارێکی زام بە لەشییەوە نامێنێ! ئیدی پاشا بە خۆشحاڵییەوە دەستووری دا کە یەکسەر ژوورێك بۆ ژنەی جادووبازو شازادەخانم ئامادە بکەن. لێ کاتێ ژنەی جادووبازو شازادەخانم بە تەنیا مانەوە، هەموو شەوێك کە شازادەخانم دەخەوت، ژنەی فێڵباز مقەستێکی لە کیسەکەی دەردێنا و دەستی دەکرد بە بڕینی جلەکانی شازادەخانم کە یەك پارچە زێڕو جەواهێرات بوون‌و ئەوجا پارچەکانی لە تورەکەکەیدا دەشاردەوە. ئەنجام کاتێ دوو رۆژەکە تەواو بوو بەر لەوەی رۆژ ببێتەوە، ژنەی جادووباز شازادەخانمی بێچارەی لە پەنجەرەی ژوورەکەوە فڕێدایە خوارەوەو

ئەوجا بەلەز لەوێندەر هەڵهات. کە ڕۆژ بووەوەو هەموو خزمەتچییانی کۆشك لە خەو رابوون، بەوپەڕی سەرسامییەوە تەماشایان کرد دەرگای ژوورەکەی شازادەخانم، کە کەس بۆی نەبوو لێی وەژوور کەوێ، نیوە کراوەیە.. کە وەژوور کەوتن سەیریان کرد چ هەواڵێك لە ژنەی جادووبازو شازادەخانم نییە! کەوتنە گەڕان و سۆراخ بەڵکو شازاداخانم بدۆزنەوە، بەڵام چەند گەڕان هیچیان لەمەڕ شازادەخانم دەستگیر نەبوو. لەو لاشەوە کاتێ کە جادووبازی حیلەکار شازادەخانمی لە پەنجەرەکەوە بەردایەوەو شازادەخانم کەوتە سەر زەوی بە هەزار زەحمەت هەستایە سەر پێیان و کەوتە گەڕان بە دەوری کۆشکەکەی بابیدا، چەند گەڕاو ئەملاو ئەولای کرد دەروازەی کۆشکەکەی بابی بۆ نەدۆزرایەوەو نەیدەزانی دەبێ چ بکات و بۆ کوێ بڕوات, ئیدی ئەم شازادەخانمەی کە لە نازو نیعمەتدا گەورە بوو بوو و هیچ شوێنێ بەڵەد نەبوو بە ناچاری ملی ڕێگەیەکی گرت و هەر ڕۆیی و ڕۆیی تا لەگەڵ خۆرئاوادا گەیشتە سەر کانی و سەرچاوەیەك. پاش ئەوەی قومێکی لە ئاوی کانییەکە خواردەوە ویستی دەم و چاویشی لە ئاوی کانییەکە بشوات، لێ کە ئەم کارەی کرد لە ناکاودا بینی کە زامەکانی دەستی ساڕێژ بوونەو هیچ شوێنەوارێکیان نەماوە! بۆیە بە خۆشحاڵییەوە دەستبەجێ لەشی لە ئاوی کانییەکە شت و دیسان سەیری کرد کەهەموو زامەکانی لەشی کەوتنە چاك بوونەوە. لەم کاتەدا بوو کە زانی گەییووەتە (کانی ئاوی ژیان) ! ئەوجا کەوتە ڕێ و پاش ماوەیەك گەییە مەزرایەك کە پیرەمێردێك لە وێندەر بوو و سەرقاڵی کار بوو. شازادەخانم چووە لای پیرەمێردو گوتی: – باوکە گیان. من چ کەسێکم نییە ئاگاداریم لێ بکات و پەنام بدات, دەکرێ بە کیژی خۆتم قبووڵ بکەی و لە ماڵی خۆتدا پەنام بدەی؟ کابرای وەرزێر کە دڵی بە حاڵی جوانی گەنجی شازادەخانم سووتا بوو، ئەوی بە کیژی خۆی قبووڵ کردو بۆ ماڵی بردەوە. کاتێ هاوسەری وەرزێرە پیرە چاوی بە شازادە خانم کەوتوو مێردەکەی حیکایەتەکەی بۆ گێڕایەوە، ژنی میهرەبان بە ڕووخۆشییەوە شازادەخانمی خێرهاتن کردو لە ماڵی خۆیدا پەنایدا. بە ڕێکەوت ئەم پیاوو ژنە، کوڕێکیان هەبوو زۆریان حەز دەکرد کیژێکی باشی بۆ بخوازن. بۆیە بە هاتنی شازادەخانم زۆر خۆشحاڵ بوون و لێبران بۆ کوڕەکەیانی بخوازن. بە کورتییەکەی شازادەخانمیان لە کوڕەکەیان مارەکردو شازادەخانم لە ماڵی ئەواندا مایەوەو دەستی بە ژیان کرد.

ساڵێك بەسەر ئەم سەربوورەدا ڕۆیی تا شازادەخانم مناڵێکی بوو، کاتێ ویستیان ناو لە مناڵەکەیان بنەن، شازادەخانم تکای کرد کە حەز دەکات خۆی ناوێکی بۆ هەڵبژێرێ، ئەوانیش قایل بوون و شازادەخانم ناوی منداڵەکەی نا (چی بووم) پاش ماوەیەك کاتێ منداڵی دووەم هاتە دنیایەوە، دیسان شازادە خانم ناوی منداڵەکەی نا (چیم؟)و سەرەنجام کاتێ دوای چەند ساڵێك کوڕی سێیەم هاتە دنیاوە، شازادەخانم ناوی نا (دەبم بە چی؟)! دیسانەوە دوای چەندین ساڵ، ڕۆژێك، کە ئەم سێ کوڕە پارچەڵە بوون، لەگەڵ باب و باپیریاندا لە مەزراکەیاندا خەریکی کار بوون و دایکیان: واتە شازادەخانم لە قەراغی مەزراکەدا سەرقاڵی چێشت لێنان بوو، دوو ڕێبواری غەریب لە مەزراکە نزیك بوونەوە،

شازادەخانم کە بە رووخۆشی بەخێرهێنانی دەکردن خوڵکی کردن کە نیوەرۆژەیان لەگەڵ بخۆن.

کە ئەوان لە ئەسپەکانیان دابەزین و گەیینە نزیکی شازادەخانم. لەپڕ شازادەخانم بەوپەڕی سەرسامی بابی و کۆنە هاودەمەکەی بابی ناسییەوە، بەڵام لەم کاتەدا خۆی لە گێلیداو بە هەمان میهرەبانی و رووخۆشییەوە بەردەوام بوو لەسەر پێشوازی کردنیان. پاش ئەوەی فراڤین خورا، شازادەخانم رووی کردە نۆبەرەکەی (چی بووم) و گوتی: – رۆڵە (چی بووم) ئەم چایە بۆ میوانەکان ببە. پاش ماوەیەك کوڕی دووەمی واتە (چیم!)ی گاز کردو گوتی: – رۆڵە (چیم) وەرە ئەم پیاڵانە کۆبکەرەوە. ئەنجام دیسان دوای ماوەیەك، کوڕی سێیەمی (دەبم بە چی) کە سەرقاڵی میوە کردنەوە بوو لە درەختان، گاز کردو گوتی: – رۆڵە (دەبم بە چی) قەرتاڵەیەك میوە بۆ میوانەکانیش بێنە! وەختێ کوڕەکە میوەکانی بۆ پاشا هێنا، پاشاکە زۆر سەری سووڕما بوو گوتی: (زۆر سەیرە! بە درێژایی ماوەی حوکمڕانی خۆم ناوی وەکو ئەمانە سەیرم نەژنەوتووە!) بۆیە رووی کردە کابرای وەرزێرو گوتی: – باوکە، ئەم منداڵانە نەوەی تۆن و دەکرێ پێم بڵێی کێ ئەم ناوە سەیرانەی لێ ناون؟ پیرەمێرد کە گوێی لەو پرسیارە بوو کەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتی بووکەکەی و ئەنجام گوتی: – بەڵێ... کاتێ کە ئەم منداڵانە هاتنە دنیاوە، ئەو بە خۆی ناوی لێنان لەم کاتەدا پاشا کە زۆر تامەزرۆ بوو بوو، رووی کردە دایکی منداڵەکان، واتە شازادەخانم و پرسی کە بۆچی ئەم ناوە سەیرانەی لە منداڵەکانی ناوە؟ شازادەخانم لە وەڵامی باوکیدا کەوتە گێڕانەوەی هەموو بەسەرهاتەکانی خۆی و کە لە قسەکانی بووەوە، پاشا تێگەیشت کە ئەم ژنە هەمان کچۆڵە گوم بووەکەی خۆیەتی کە دەستی قەدەر دووبارە بە یەکی گەیاندوونەتەوە. بەدەم گریانی خۆشحاڵییەوە شازادەخانمی لە هەمێز گرتوو رایمووسی. ئەوسا هەموویانی بۆ کۆشکەکەی خۆی بردەوەو ئەوانیش لە شاراو لە کۆشکە جوانەکەی پاشای پیردا ژیانێکی خۆشیان دەست پێکرد....

## پورە ئایشێ

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو، پیاوێك هەبوو کە زۆر خواناس و ئەهلی نوێـژو دوعاو وێرد بوو، کچێکی هەبوو بە نێوی فاتیمە کە تاقە یاوەرو هاودەمی بوو. فاتیمـە هـەر بـە منداڵی دایکی لە دەست دابوو و ئێستا بە تەنێ لەگەڵ بابیدا لەماڵێکا دەژیان.

بابی فاتیمە هەموو ساڵێك بۆ چەند رۆژێکی دیاریکراو فاتیمەی بە جێدەهێشت و دەچوو بۆ زیارەتی مەکە. رۆژێك کە دەیویست سەفەری ماڵی خوا بکات، بارگەی پێچایەوەو ئەوجا کیژەکەی گاز کردو گوتی:

– کچەکەم تا من لە سەفەر دەگەڕێمـەوە تـۆ نـابێ لـە مـاڵ بچیتە دەرێ، بـە تایبـەتی ئاگات لەوەبێ کە دەرگا لە کەس نەکەیەوە!

پاش ئەم راسپاردەیە، خوا حافیزی لە کیژەکەی کردو کەوتە رێ، فاتیمە بە تاقی تەنیا لە ماڵ مایەوە. رۆژێك کە فاتیمە بۆ ئاو دەرهێنـان لـە بیرەکە هـاتبووە نێـو حەوشـە، سـەتڵەکەی هەڵگرت و بەردێکی گەورەی پێوەبەست و هەڵیداشتە نێوە بیرەکە. بـەڵام کـە سـەتڵەکە پـڕ بـوو دەستی بە هەڵکێشانەوەی کـرد، بەردەکـە تـرازاو کـەوت بـە دیـواری بیرەکـەدا. لـە پـڕ کـونێکی گـەورە بـووە دیـواری بیرەکـە، کـە فاتیمـە دانەوییـەوەو سـەیری نـاو کونەکـەی کـرد، لـەو دیـو کونەکـەوە دیمـەنێکی سـەیری بـینی. بـاخێکی یـەجگار جـوان لـەو دیـو کونەکـەوە دەهاتـە بەرچاو... ئەوجا باخ چ باخێ... هێندە خۆش بوو لە تۆ وایە بەهەشتە. لق و پـۆپی درەختـان لەبەر بـەری درشـت و ئـاودار هـەموو شـۆڕ بـوو بوونـەوە، زەمینی باخەکە یەکپارچە چیمەن و گوڵی وردی رەنگاو رەنگ بوو، جووکەو جریوەی مـەلانی خۆشـئاواز کە لـەم چڵ بـۆ ئـەو چڵ دەفڕین، هەموو باخەکەی پڕ کردبوو. جگە لە هەموو ئەمانە، لە ناوەندی باخەکەدا حەوزێکی گەورە هەبوو کە شازادەو شازادەخانمێکی لاوی یەکجار جوان لە قەراخیا دانیشتبوون، بـەڵام سـەیر ئەمـە بـوو کـە ئـەم دووە نـەك هـەر قسـەیان نـەدەکرد بـەڵکو هەریەکـەیان بـە تووڕەییـەوە چـاویان بـڕی بـووە گۆشـەیەك. لـەم کاتـەدا، غوڵامێـك بـە سـینییەك شـەربەتەوە هـات و سـەرو پەرداخی لەبـەردەم دانـان، بەڵام کـاتێ شـازادە فڕێکـی لـەم شـەربەتە خـوارد لـە پـڕ بورایـەوەو کـەوت. شـازادەخانم سەرسـام و حـەیران دەسـتی بـە یـەکاداو داوای کۆمـەکی کـرد کـە فریـای دەزگیرانەکەی بکەون، بەڵام جگە لە باخەوانێکی پیر کەسـی دی لـەو نـاوە نـەبوو، باخەوانەکە بە دەنگییـەوە چـوو. لـێ بـە رێکـەوت ئـەم باخەوانـە پـیرە دیمـەنێکی زۆر پێکـەنیناوی هـەبوو، سمێڵێکـی زۆر پـان و درێـژو خەنـدەداری هـەبوو. شـازادەخانم کـە چـاوی بـە دیمـەنی ئـەم باخەوانە کەوت، بـە تـەواوەتی دەزگیرانەکـەی بیر چووەوەو دەسـتی بـە قاقـای پێکـەنین کـرد، پێکەنین بۆ ئێستا نەبێ بۆ کەی باشە. فاتیمە بەسەرسامی دەیڕوانییە ئەم دیمەنە. لەم کاتەدا زۆر رقـی لـە بـێ موبـالاتی شـازادەخانم هەسـتا، بەهێیـەکی گـەورەی لـە درەختێکـی نـاو حەوشەکەیان کردەوەو خێواندییە شازادەخانم. بەهێیەکە راستەوخۆ بەر سەری شازادەخانم،

کە هەر خەریکی پێکەنین بوو، کەوت، ئەم بەهێیە ئەوەندە قورس بوو کە شازادە خانمی بەناز پەروەردە لە تاو ئازار هاوارێکی کردو دەستی خستە سەر نێوچەوانی. ئەنجام وەختێ شازادە بەهۆش هاتەوەو شازادەخانم حیکایەتی ئەم بەهێیەی بۆ گێڕایەوە، شازادە بەتوڕەییەوە بەهێیەکەی لەزەوی هەڵگرتو دەستووریدا کە بڕۆن تاقیب بکەنو بزانن ئەم بەهێیە لە درەختی کام ماڵە کراوەتەوە، تا خاوەنەکەی سزا بدەن.

خولامانی شازادە یەکسەر دەستوورەکەیان ئەنجامدا، لێ لە هەر کەسێکیان دەپرسی، دەیگوت ئەم بەهێیە هی ماڵی بابی فاتیمەیە. وەختێ شازادە کە زانی خاوەنی چاو قایمی ئەم بەهێیە کێیە، لێبڕا سزای بدات. بۆیە خۆی گۆڕیو خۆی کردە پیرەژنێکی چەرچیو چوو بۆ ماڵی فاتیمە، پاش ئەوەی لە دەرکەیدا وەستا. لەم کاتەدا فاتیمە هاتە پشت دەرگاکەو بێ ئەوەی دەرگاکە بکاتەوە پرسی:

- کێیە؟

شازادە بە دەنگێکی ناسك وەڵامی دایەوە:

- منم، ئەی نازدارەکەم من! من پورە ئایشێتم کە دۆستێکی کۆنی دایکت بووم، ناتەوێ دەرگا بکەیەوە؟

ئیدی فاتیمە کە گوێی لەو قسانە بوو بە خۆشحاڵییەوە دەرگای کردەوەو گوتی:

- ئۆو پوری ئازیزم، تا ئێستا لە کوێ بووی، بۆچی من پێشتر تۆم نەدیووە. تکایە وەرە ژوورەوە. تۆ نازانی من چەند تەنیام، خوا خوامە هاودەمێکم هەبێ!

چونکە فاتیمە زۆر تەنیاو بێ تاقەت بوو، بۆیە بە میهرەبانییەوە شازادەی بردە ژوورەوەو ماوەیەك قسەوباسیان کردو ئەوجا فاتیمە لە پڕ هاوارێکی کردو گوتی:

- وەی پورێ گیان، دەزانی من چیم کردووە!

ئەوجا حیکایەتەکەی ئەو شازادەیەی کە بورابووەوەو، هەروەها حیکایەتی ئەو بەهێیەی کە خێواندبوویە شازادەخانم، هەمووی بۆ پورە ئایشێ گێڕایەوە. کاتێ شازادە ئەم حیکایەتەی گوێ لێ بوو، گوتی:

- زۆر باشت کرد کیژم، دیارە ئەم شازادەخانمە کیژێکی زۆر ناڕەسەن بووە!

ئەوجا خوا حافیزی لە فاتیمە کردو ڕۆیی. ئیدی لەو ڕۆژە بە دواوە شازادە هەموو ڕۆژێك خۆی دەکرد بە پورە ئایشێو دەچووە دیدەنی فاتیمەو تاوێکی باش بۆ خۆ قسانیان دەکردو حیکایەتێ لێرەو حیکایەتێ لەوێ. بەڵام کە هاتنەوەی بابی فاتیمە لە سەفەر نزیك بووەوە، وا دەهاتە بەرچاو کە پور ئایشێ زۆر پەلەی هاتنەوەی ئەو بێ. بە هەر حاڵ ڕۆژێك بابی فاتیمە لە سەفەر گەڕایەوە. بەڵام کە گەییە ناو شار، لە ڕێگە لایدایە قاوەخانەیەكو لەوێ بیستی کە شازادە ناردویەتی بە شوێنیا. پیرەمێرد کە سەری لەمە سوڕمابوو و نەیدەزانی مەسەلە چییە، چوو بۆ کۆشکی شازادە. شازادە کە پیرەمێردی بینی بە میهرو سۆزەوە لەلای خۆیەوە داینا، ئەوجا پێی گوت گەر خوا بیکا حەزی لێیە خوازبێنی کیژەکەی بکات. بابی فاتیمە کە

ئەمەی بیست، بە خۆشحاڵییەوە بەرەو ماڵ دایکێشاو ئەم هەواڵەی بە فاتیمەداو فاتیمە بە خۆشحاڵییەوە هاواریکرد:

– ئای باوکە، تۆ نازانی چەند خۆشحاڵم. لێ من دەخوازم ئەم مژدەیە بە پورە ئایشێ بدەمو ئەو ڕێم پێ نیشاندەدات کە چ کارێك بکەم. ئاخر ئەو لە جێی دایکمە!

ڕێك لەم کاتەدا، دیسانەوە شا زادە لە شێوەی پورە ئایشێداخۆی بە ماڵی ئەواندا کرد، کیژێ بە خۆشحاڵیی و ساویلکەییەوە بەرەو پیری چوو و پاش ئەوەی ئەم خەبەرە سەیرەی بۆ گێڕایەوە لێی پرسی ئایا ئەم شووە بە باش دەزانێ یان نا؟

شازادە، کە کە دەیویست پێکەنینەکەی وەشێرێ بەرسڤی دایەوە:

– نازدارەکەم تۆ دەبێ یەکسەر داواکەی شازادە قەبوڵ بکەیو کەمو زۆر ماتەڵ نەبی!

بەم پێیە بابی فاتیمە، یەکێکی نارد بۆ لای شازادەو هەواڵی دایێ کە فاتیمە ڕازییە شووی پێبکات. ئیدی یەکسەر تەدارەکی شایی و ئاهەنگێکی بەشکۆ بینراو هەموو بە خۆشحاڵییەوە چاوەڕوانی ڕۆژی زەماوەند بوون. کاتێ ڕۆژی زەماوەند هات، فاتیمە کە زۆر دڵبەندی پورە ئایشێی ئازیز! بوو، پێی گوت کە حەز دەکات لە هەموو ئاهەنگەکەدا لەگەڵی بێ. لێ پورە ئایشێ ئەم داوایەی قبووڵ نەکردو کە فاتیمە هەر دەستبەردار نەبوو. پورە ئایشێ خۆی بە ئاشخانەکەدا کردو وا خۆی نیشاندا کە خەریکی چێشت لێنانە... بەڵام لە پڕ هاواری کرد کە قامکی بڕیوە. لەم کاتەدا فاتیمە بە ناڕەحەتی چوو بۆ لای و بە دەستەسڕە ئاوریشمەکەی خۆی پەنجەی بەست. بەڵام بەم فێڵەشەوە کە پورە ئایشێ کردی، کیژێ هەر قاییل نەبوو کە پورە ئایشێ لێی دوور بکەوێتەوە.

ئەنجام دوای ماوەیەك، کاتێ شەو هات، فاتیمە کەلە ژوورەوە چاوەنۆڕی هاتنی زاوا بوو، پورە ئایشێ چووە ژووری بووکێو لە پڕ جلە ژنانەکانی داکەندو فاتیمە بەوپەڕی سەرسامی بینی شازادە کە خودی زاوا بوو لەوێ وەستاوەو.... پورە ئایشێی خۆشەویستی بۆ هەمیشە لەو ناوە نەما.... ئەنجام کە فاتیمە زانی مەسەلەی پورە ئایشێ تەنیا گەمەیەك بووە، زۆر بەم گەمەیە خۆشحاڵ بوو و هەردووکیان تا ماوەیەکی زۆر پێکەنین. چونکە ئەم گەمەیە ئاقیبەتێکی خۆشی هەبوو، بووە باعیسی ئەوەی دوو دڵدار بە یەکتر بگەن، ئیدی لەوەدوا ساڵانی ساڵ ئەم دوو هاوسەرە بە خۆشی و شادییەوە ڕۆژگارێکی شیرینیان پێکەوە قەتاند.

## نیعمەتی خوایی

هەبوو نەبوو لە عەیامو رۆژگاری کۆندا، پاشایەك هەبوو کە سێ کیژی هەبوو. رۆژێك پاشا کە بنیادەمێکی زۆر لە خۆبایی و لە خۆڕازی بوو، کیژە گەورەکەی گازکردو پێی گوت:

- کیژم دەمەوێ پرسیارێکت لێبکەمو دەبێ راستیم پێ بڵێی، ئایا نیعمەتی خوایی بە بایەخترە یا پایەو مەقامی پاشایی؟

کیژەکە بەبێ هەڵوەستە وەڵامی دایەوە:

- باوکی خۆشەویستم، شتێکی بەڵگە نەویستە کە مەقامی پاشایەتی لە هەموو نیعمەتەکانی خوا بایەخدارترە.

پاشا کە زۆر دڵی بە وەڵامی کیژەکەی خۆش بوو بوو، بە ئاسوودەییەوە گوتی:

- کچە ئازیزەکەم مادامێکی تۆ کیژێکی ئەوەندە ئاقڵو زرنگی، ئەوا مۆڵەت دەدەم کە مێرد بە کوڕە لاوەکەی وەزیری دەستە راستم بکەی!.

ماوەیەك بوری، پاشا ئەمجارەیان کیژی دووەمی گازکردو گوتی:

- کیژم دەمەوێ پرسیارێکت لێبکەم بزانم ئایا نیعمەتی خوایی یا پایەی پاشایەتی باشترە؟

ئەمجارەشیان کیژی دووەم بێ دوو دڵی و بیرکردنەوە وەڵامی دایەوە:

- ئەی بابی خاوەن تاج، گومانی تێدا نییە کە پایەی پاشایەتی باشترە

پاشا کە بە وەڵامی کیژەکەی زۆر خۆشحاڵ بوو بوو گوتی:

- ئەها، تۆش وەڵامەکەت راستە، بۆیە رێگە دەدەم کە شوو بە کوڕی وەزیری دەستە راستم بکەیت!

پاشان پاشا رۆژێکی تر کچە بچووکەکەی گاز کردو هەمان پرسیاری لێکرد. بەڵام ئەمجارە کیژێ بە پێچەوانەی خوشکەکانییەوە، ماوەیەك تێفکریو سەرەنجام گوتی:

- ئەی باوکی خاوەن تاجم، گومانی تێدا نییە کە مەقامی تۆ زۆر بایەخدارو گەورەیە، لێ ئەو نیعمەتانەی کە خوا بە خەڵکی داوە، گەورەترین بەهاو بایەخیان هەیە!

پاشای خۆپەسند کە چاوەڕوانی ئەم وەڵامە نەبوو، زۆر لە خۆسەری کیژەکەی توڕە بوو و گوتی:

- کیژۆڵەی بێ حەیا، خێرا لەبەر چاوم ونبە، چۆن زات دەکەی قسەی وەها بکەی، ئێستا دەبینین کە خوا چ نیعمەتێك بە تۆ دەدات.

ئیدی پاشای لە خۆڕازی دەستووریدا کە کیژۆڵەی داماو لە کۆشكو لەو شارە وەدەرنێن. بەمجۆرە شازادەخانمی داماو بەدەم ئەشکڕشتنو خەمبارییەوە لە کۆشك دەرکراو ئەو شارەی بەجێهێشتو بە پێیانو بێ ئەوەی بزانێ بۆ کوێ بڕوات بەرەو کێوان وەڕێکەوت. چەندین رۆژی یەك لە دووی یەك، شازادەخانم، ئەو کیژۆڵەیەی کە لە نازو نیعمەتدا گەورە

بـوو بـوو، وێـڵ‌و سـەرگەردان نەیـدەزانی روو لـە کـێ بکـات، تـا سـەرەنجام چـاوی بـە شوانکارەیەك، کە سەرقاڵی پەز لەوەڕاندن بوو، کەوت، بە خۆشحاڵییەوە بەرەو ئەو چوو و گوتی:

– ئەی شوانی میهرەبان، من هیچ شوێنێکم نییە تیای بحەوێمەوەو کەسیش لەم دنیایەدا ناناسم کە پەنای وەبەر بەرم، ئایا دەتوانی بمکەیت بە کیژی خۆت‌و لە کوختەکەتدا بژیم؟

شوانەکە کە دڵی بە حاڵی کیژۆڵەکە سووتا بوو، رازی بوو. کە شەو داهات پێکەوە بەرەو کوختەکەی شوانەکە وەڕێکەوتن.

بەمجۆرە شازادەخانم بوو بە کیژی شوانەی پیرو لەگەڵ ژنی شوانەدا کە ژنێکی یەجگار میهرەبان بوو، لەگەڵ کوڕی شوانەدا لەو کوختەدا دەژیان. کاتێ شوانەو کوڕەکەی بە رۆژەوە دەچوونە دەرێ، شازادەخانم سەرگەرمی گسکدان‌و پاك کردنەوەی ماڵەکە دەبوو، بە کورتی لە کاروباری ماڵەوەدا کۆمەکی ژنی شوانەی دەکرد.

ماوەیەك بوری تا رۆژێك شوانە شازادەخانمی گاز کردو پێی گوت:

– ئەرێ ئەگەر رەزای خوای لەسەر بێ، من دەخوازم بە کوڕەکەمت بخوازم، ئایا تۆ بەم کارە قاییلی؟

شازادەخانم کە بەم کارە قاییل بوو، سەرگەرمی تەدارەکی ئاهەنگێکی هەژارانەی نیشانکردن بوو بۆ خۆی‌و کوڕی شوانە. بەڵام ماوەیەکی زۆر بەسەر زەماوەندەکەیاندا نەبوری بوو کە رۆژێك شوانەی پیر نەخۆش کەوت‌و کاتێ هەستی کرد مەرگی نزیك بووەتەوە کوڕەکەی گازکردو گوتی:

– کوڕم من مەرگم زۆر نزیك بووەتەوەو تۆ دەبێ لە دوای من هەموو کاروباری ماڵەکەو لەوەڕاندنی پەزەکان لە ئەستۆ بگری. ئەنجام پاش ئەوەی قسەکانی تەواو بوون، کیژۆڵەکەی، واتە شازادەخانمی بەو سپاردو مرد.

بەڵام کوڕەی لاو، دوای مردنی بابی، کاروبارەکانی ئەوەندە زۆر بوو، پێڕا نەدەگەیی، ئیدی رۆژێ بە شازادەخانمی گوت کە لێبڕاوە بۆ دۆزینەوەی کارێکی باشتر روو لە شارانی دی بکات.

بەمجۆرە پاش خوا حافیزی لە شازادەخانم‌و دایکی لەگەڵ سێ برادەری دیکەی خۆیدا سەفەری کرد هەر رۆییشتن رۆییشتن تا گەیینە شارێك ئەم شارە، شارێکی زۆر سەیر بوو، هەموو خەڵکەکەی خەریك بوو لە تینوواندا دەمردن، چونکە تەنیا یەك بیری گەورە لەم شارەدا هەبوو کە لەمێژ بوو وشکی کردبوو، خەڵکی شار قرێریان دابوو هەر کەسێك بچێتە ناو بیرەکەوەو ئاویان بۆ دەربێنێ سەد سکەی زێڕی بدەنێ. کاتێ شوانەی لاو، کە تازە گەیی بووە ئەو شارەو بەمەی زانی، یەکسەر ملی پێوەناو بە بیرەکەدا داگەڕا. لێ کە گەییە بنی بیرەکە شتێکی زۆر سەیری بینی، بە سەرسامییەوە چاوی بە پیرە دێڵە دێوێك کەوت کە

کوڕو کچێکی گەنجی جوانی بە زنجیر بەستبووەوەو بە خۆی چاودێری دەکردن، کاتێ پیرە چاوی بە شوانەی لاو کەوت، بە دەنگێکی سەیر گوتی:

– وەرە بەرەوە ئەی ئادەمیزاد، دەمەوێ پرسیارێکت لێبکەم! بەڕای تۆ لەم سییانە کاممان جوانترین!

شوانە یەکسەر وەڵامی دایەوە:

– ئەو شتە جوانە کە دڵ پێی جوان بێ.

لێ پیرە دێو پرسیارەکەی دووبارە کردەوەو شوانەش هەمان وەڵامی دایەوە، بەکورتی کە سێ جار هەمان پرسیاری دووبارە کردەوەو هەمان وەڵام درایەوە، پیرە دێو کە زۆر بە وەڵامی شوانە خۆشحاڵ بوو بوو گوتی:

– زۆر چاکە، تۆ کوڕێکی زۆر چاکی، هەرچی ئارەزوویەکت هەیە لە منی داوا بکە.

شوانەی لاو هەندێ تێفکری و گوتی:

– یەکەمین ئارەزووی من سەلامەتی تۆیە، و دووەمین ئارەزووم ئەمەیە کە خەڵکی شار لە تینویەتی رزگار بن.

پیرە دێو وەڵامی دایەوە:

– زۆر چاکە، ئەوا ئەم دوو ئارەزووەت هاتنە دی.

پاش ئەم قسەیە، سێ هەناریشی دایێ، شوانە پاش ئەوەی سوپاسی کرد، بە بیرەکەدا سەرکەوتەوە، هەر کە لە بیرەکە وەدەرکەوت بارانێکی زۆر دایکردو هەموو خەڵکی شار لە خۆشیاندا پێیان بە عاردی نەدەکەوت. زۆر سوپاسیان کردو سەد سکە زێڕەکەیان دایێ. شوانە پاش ئەوەی پارەکەی وەرگرت، لەگەڵ ئەو سێ هەنارەدا کە پیرە دێوەکە دابوویێ، هەموویدا بە یەکێك لە برادەرەکانی و داوای لێکرد بۆی بەرێتە ماڵەوەو بیدات بە ژنەکەی، ئەوجا ئەو شارەی بەجێ هێشت و روویکردە شارانی دی.

کاتێ برادەرەکەی شوانە گەییەوە جێ و پارەو هەنارەکانی دا بە هاوسەرەکەی، شازادەخانم کە تا ئەو کاتە هەناری ئەوەندە گەورەی نەبینی بوو نەوس گرتی و ئارەزووی خواردنی یەکێ لە هەنارەکانی کرد.... بەڵام کە یەکێك لە هەنارەکانی شەق کرد، بینی لە جیاتی دەنکە هەنار پڕە لە دانە ئەڵماسی درشت و زۆر گرانبەها، شازادەخانم کە بێئەندازە خۆشحاڵ بوو بوو، یەکسەر چووە لای خەسووی و پاش ئەوەی پارچەیەك لەو ئەڵماسانەی دایێ، گوتی یەکسەر بچێتە لای جەواهێر فرۆشی شارو بیفرۆشێت.

کاتێ پیرەژن چووە لای جەواهێرفرۆش و ئەڵماسەکەی نیشاندا، لە کاتێکا کە کابرای جەواهێر فرۆش بەسەر سامییەوە دەیڕوانییە ئەم ئەڵماسە درشت و گرانبەهایە، و تا ئێستا ئەڵماسی وا چاك و گرانبەهای نەدی بوو، پیرەژن گوتی:

– من دەمەوێ ئەم ئەڵماسە بە دوو بار زێڕ بفرۆشم!

بەڵام کابرای جەواهێر فرۆش کە ئەو پارە زۆرەی نەبوو، بە پیرەژنی گوت کە بچێ بۆ لای جەواهێر فرۆشەکانی دیکەی شار. بەڵام هیچ یەکێك لە جەواهێر فرۆشانی شار ئەو

پارەیەیان نەبوو. ئەنجام وەختێ پیرەژن چووە لای دوا جەواهێر فرۆش، بەو نرخەی کە پیرەژن داوای دەکرد ئەڵماسەکەی کڕی. پیرەژن پاش ئەوەی دووبار زێڕی قورسی لە دوو وشتران نا، گەڕایەوە بۆ کوختەکەی خۆیانو دای بە شازادەخانم. شازادەخانم کە ئیدی زۆر دەوڵەمەند بوو بوون، دەستووریدا کە کۆشکێکی بەشکۆیان لە نزیکی کۆشکەکەی بابی بۆ دروست بکەن. ئەم کۆشکە هێندە بەشکۆو رازاوە بوو کۆشکەکەی پاشا لە چاویا لە کولانە مریشکێکی پەڕپووت دەچوو. پاش ئەم کارە ئیدی شازادەخانم زۆر بە دڵاوایی خولامەکانی راسپارد کە هەر رێبوارێك بەوێدا رەت بوو پێشوازی بکەن نانو خواردن و پارەی بدەنێ. بەمجۆرە زۆری نەبرد کە ئەفسانەی ئەم کۆشکە جوانەو چیرۆکی دڵاوایی خاوەنەکەی کەوتە سەر زارانو خەڵکی باسیان دەکرد.

چەند ساڵێك بوری، رۆژێك خانمی کۆشك، واتە شازادەخانم بە خەمباری لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەیدا دانیشتبوو، چونکە لەم چەند ساڵەدا هیچ هەواڵێکی لەمەڕ مێردەکەی نەدەزانیو نەیدەزانی چی بەسەر هاتووە، لە نکاو چاوی بە پیاوێك کەوت کە لە هەمان شوێنی جارانی کوختەکەیان دانیشتووەو بە کوڵ دەگری. کاتێ جوان دیقەتی دا بۆی دەرکەوت کە ئەم پیاوە خەمگینە مێردەکەی خۆیەتی. بۆیە بە خۆشحاڵییەوە دەستووری بەخولامەکانی دا کە بچنە دەرێو ئەو پیاوە بەبێ ئەوەی ئەزیەتی بدەنو بیترسێنن بێننە ژوورەوەو خواردنی بدەنێ بەلام نەیەڵن لە کۆشکەکە وەدەربکەوێ. کاتێ ئەم کارانە ئەنجام درانو پیاوەیان کە سەرسامو کەمێك ترسا بوو، هێنایە لای شازادەخانم لە پڕ هاوسەرەکەی خۆی ناسییەوە. لە کاتێکا کە جلی زێڕتاڵو گرانبەهای لەبەردا بوو، لەسەر تەختێك دانیشتبوو چەند هاودەمو کارەکەرێك بەدیارییەوە وەستا بوون... لەم دەمەدا پیاوە بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بەرەو لای هاوسەرەکەی غاریداو پاش ئەوەی یەکیان لە هەمێز کرد، کابرای لاو بە سەرسامی پرسی کە ئەم کۆشکە جوانە چۆن پەیدا بووە. ئەوجا هاوسەرەکەیو دایکی لە نووکەوە حیکایەتی سێ هەنارە ئەفسوناوییەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئیدی پاش ئەوەی شازادەخانم هیچ خەمێکی لە دڵ نەما، لەگەڵ مێردەکەیدا ژیانێکی خۆشیان دەست پێکرد.

گوتمان کە ئەفسانەی ئەم کۆشکەو خانمی دڵاوای کۆشك گەییە پاشاش، بیستبووی کە دەرگای ئەم کۆشکە لە هەموو کەسێك کراوەیە... رۆژێك پاشا کە ئەم کۆشکەی لێ بوو بوو بە مەراق و حەزی دەکرد لە نزیکەوە بیدینێو پەی بە نهێنی ئەم کۆشکە بەرێ، جلی دەروێشی لەبەر کردو لەگەڵ یەکێك لە خولامەکانیدا بەرەو کۆشکی شازادەخانم وەڕێکەوت. لێ وەختێ پاشاو خولامەکەی گەیینە کۆشکی شازادەخانم، شازادەخانم غولامەکەی بابی ناسیبووەوە، یەکسەر دڵی خەبەریدا کە هەبێو نەبێ ئەو دەروێشەش بابێتی، یانی پاشایە. یەکسەر خولامەکانی گازکردو دەستووریدا کە مێزێکی گەورە بڕازێننەوەو هەموو جۆرە خواردنێکی نایابی لەسەر دابنەن. پاشا وەختێ هاتە ناو کۆشکەوە زۆری پێ سەیر بوو کە زیافەتێکی گەورەی بۆ بەرپا کراوە، وەك بڵێی خانمی کۆشك پێشتر چاوەڕوانی ئەو بووە! بە کورتی ئەمەی زۆر بەلاوە سەیر بوو و نەیدەزانی چۆن بیر لەم کارە بکاتەوە. ئەنجام پاش

**ئەوەی کە نانەکەیان خوارد هێشتا پاشا حاڵی نەبوو بوو کە خاوەنی ئەم کۆشکە جوانە کێیە.**

**لەم کاتەدا هەستاو ویستی خوا حافیزی بکات، لێ خاوەنی ماڵ، واتە هەمان شوانەی جاران، رایکردە بەرەوەو گوتی:**

- **ئا ئەی پیاوی پیرۆز، هاوسەرەکەم ماوەیەکە نەخۆشە، دەکرێ بچیتە دیاریو دوعایەکی بۆ بکەی!**

**وەختێ پاشا خۆی بە ژوورەکەی شازادەخانم دا کرد، شازادەخانم کە لەسەر تەختێکی جوان خەوتبوو، لە جێی خۆی هەستاو گوتی:**

- **باوکی پیرۆز، رێم دەدەی دەستت ماچ بکەم؟**

**لێ وەختێ پاشا چاوی بە شازادەخانم کەوت، یەکسەر حاڵی بوو کە هەمان کیژەکەی خۆیەتی کە بەوپەڕی دڵڕەقییەوە شار بە دەری کردبوو، بۆیە شەرمەزارو پەشیمان لەو کارەی کە دەرهەق بەو کردبووی، سەری داخست. شازادەخانم لەم دەمەدا گوتی:**

- **ئێ بابی ئازیزم، ئێستا پێم بڵێ کە ئایا نیعمەتی خوا باشترە یا مەقامی پاشایەتی؟**

**پاشا وەڵامی دایەوە:**

- **هەق بە تۆیە کیژم. نیعمەتی خوا لەسەرووی هەر نیعمەتێکەوەیە**

**بە کورتی پاش ئەوەی کە شازادەخانم لە بابی خۆش بوو، پاشا کابرای شوانی بە جێنشینی خۆی هەڵبژاردو تاجی پاشایەتییەکەی لەسەر ئەو ناو بەمجۆرە شوانی لاو بوو بە پاشای ئەو مەملەکەتە. پاش ئەوە هەموو بە خۆشی و شادی ژیان.**

# سەر بوری ژنێکی باشی هەژار

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو، ژنێکی هەژار هەبوو کە ژنێکی گەلەك باش‌و میهرەبان بوو. بەڵام لەو دنیایەدا هیچ قەوم‌و قیلەیەکی نەبوو جگە لە دوو کوڕە چکۆلەکەی. بە کورتی بەتاقی تەنیا چەرخی ژیانی خۆی دەگێڕا. بۆیە کە هاوین دادەهات، بڕێ سەوزەو شتی لە زەوییە چکۆڵەکەیدا دەڕواند تا بیانفرۆشێ‌و ژیانی خۆی بەڕێوەبەرێ. کە زستان دادەهات هەندێ لەو سەوزی وخواردەمەنیانەی دەبردە بازاڕو دەیفرۆشت‌و بەمجۆرە سکی خۆی و منداڵەکانی تێر دەکردو ژیانێکی بژی‌و مەمریان دەقەتاند.

تا رۆژێکی زستان، لە کاتێکا یەکێك لە منداڵەکانی لە خورجینەکە نابوو و ئەویتریانی لە باوەش کردبوو، بۆ فرۆشتنی بەروبوومەکەی بەرەو بازاڕ بەڕێکەوت. کە گەییە بازاڕو پاش ئەوەی بە هەزار زەحمەت گەنم‌و جۆیەکەی فرۆشت، باروبنەی پێچایەوەو دووبارە یەکێك لە منداڵەکانی لە پیرە خورجین ناو ئەویتریانی لە هەمێز کردو بەرەو ماڵ کەوتە رێ. بەدەم رێوە گەییە پردێکی زۆر باریك‌و دەبووایە بەسەریدا بپەڕێتەوە، لێ ئەم ژنە داماوە چۆن دەیتوانی بەو بارە قورسەوە بەسەریدا بپەڕێتەوە. ناچار خورجینەکەی لە عاردی داناو پاش ئەوەی یەکێك لە منداڵەکانی لەگەڵ خۆیدا بردە ئەو بەرو گەڕایەوە تا منداڵی دووەمیشی بپەڕێنێتەوە. بەڵام کاتێ هات منداڵی دووەمی ببات بەوپەڕی سەرسامی بینی کە شێرێك منداڵەکەی بەدەمەوە گرتووەو دەیەوێ بیبات. ژنەی داماو کە بینی ئەم منداڵەی لە دەس چووە، بە ناڕەحەتی غاریدا بۆ ئەو دیوی پردەکە تا بەلای کەمەوە منداڵەکەی دیکەشی لە دەست نەچێت.. کە گەییشتەوە ئەوبەر سەیری کرد منداڵەکەی دیکەشی بەدەم گورگێکەوەیە خەریکە دەیڕفێنێ. ژنەی بەستەزمان تیامابوو نەیدەزانی دوای شێرەکە بکەوێ یان دوای گورگەکە.... یەکەم جار دووی شێرەکە کەوت، بەڵام کە بۆی دەرکەوت مەحاڵە بەشێرەکەدا بگات، کەوتە دووی گورگەکە. بەڵام هەرچی کرد نەگەیی بە گورگەکەشدا، ئیدی دایکەی داماو کە هەردوو منداڵەکەی لە دەست دابوو، بەدەم گریان‌و رۆندك رشتنەوە، ناچار بوو بە تاقی تەنێ بۆ ماڵ بگەڕێتەوە.

بابێینە سەر باسی شێرەکە، شێرەکە کە زۆر بەو نێچیرەی پەیدای کردبوو، خۆشحاڵ بوو بەرەو لانەکەی کەوتە رێ بەڵام غافڵ بوو لەوەی کە راوچییەکی لێزان و کارامە تەڵەیەکی لە قەراخ لانەکەیدا بۆ ناوەتەوە. کاتێ شێرەکە منداڵەکەی بە دەمەوە گرتبوو و گەییە لانەکەی خۆی، بە تەڵەکەوە بوو، بەڵام کە کابرای راوچی نزیك بووەوە زۆری پێ سەیرد بوو کە منداڵێکی چکۆلەش بە تەڵەکەوە بووە، ئیدی زۆری بەزەیی بە منداڵە چکۆلەکەدا هاتەوە. هەڵگیرت‌و بردییەوە بۆ ماڵەوە. ئیدی وەکو منداڵی خۆی کەوتە بەخێوکردن‌و پەروەردەی.

کوڕی دووەمیش، بە هۆی راوچییەکەوە کە گورگەکەی کوشتبوو لە مەرگ رزگار بوو بوو. ئەم راوچییەش کە پیاوێکی میهرەبان بوو منداڵەکەی بردبووە ماڵەوەو دەستی بە

بەخێوکردنی ئەم منداڵە شیرە خۆرەیە کردبوو. ساڵانێك بەسەر ئەم ڕووداوەدا بوری، و ئەو منداڵە بچووکانە لەلای ئەو ڕاوچییانە مابوونەوەو گەورەبوو بوون‌و دوو لاوی بەهێزو توانایان لێ دەرچوو بوو. ڕۆژێ ئەم دوو ڕاوچییە زڕ کوڕەکانیان گاز کردبوو و پێیان گوتبوون کە لە ئێستا بە دواوە دەبێ بۆ خۆیان کارێك بدۆزنەوەو خۆیان بژێنن. ئیدی ماڵئاوایی لە زڕ بابەکانیان دەکەن‌و خۆ دەدەنە دەم چارەنووسەوەو لە کار دەگەڕێن.

کوڕی یەکەم سواری کەشتییەك دەبێ کە بەرەو بەغدا دەڕۆیی، کزو خەمبار لە سوچێکی کەشتییەکەدا دادەنیشێت‌و بیر لە ژیانی ڕابرو و ئایندەی خۆی دەکاتەوە. ئەزقەزا برای دووەمیش کاتێ شار بە جێ دێڵێ، سواری هەمان کەشتی دەبێ کە براکەی تێدا دەبێ، ئەویش خۆی دابووە دەست قەدەرو چارەنووس. بەڵام لە کاتێکدا کە بە حەوشەی کەشتییەکەدا دەهات‌و دەچوو، چاوی بەو پیاوە دەکەوێ کە لە سووچێکی کەشتییەکەدا غەمگین‌و مەلول کزۆڵەی کردبوو، لێی نزیك دەبێتەوەو هۆی خەم‌و پەژارەکەی دەپرسێت:

بە کورتی لە کاتێکا ئەم جووتە برایە کە بە هیچ جۆرێ نەیاندەزانی برای یەکترن، کەوتنە قسان‌و دەردە دڵ. بەڵام بە هۆی خوێنی برایەتییەوە، لە ماوەیەکی کەمدا خۆشییان بە یەکدا چوو و قسەو باسیان لەگەڵ یەکدیدا گەرم بوو. هەر کەسەو کەوتە باسی ژیان‌و بەسەر هاتی خۆی، کاتێ کە هەستیان کرد هەردووکیان دووی چارەنووس کەوتوون، لێبڕالن لەوەودوا هەمیشە بە یەکەوە بن. بۆیە کە گەیینە جێ پێکەوە لە کەشتییەکە دابەزین‌و بەناو شار کەوتن, کاتێ گەیینە بازاڕ، پاش ئەوەی کە ماوەیەك ئێرەو ئەوێ بۆ کار گەڕان، سەرەنجام بوون بە شاگردی کابرایەکی حەماڵ‌و شانیان دایە بەرکار. کە شەو هات و شوێنی خەویان نەبوو، ناچار بوون شوێنێ بۆ خۆیان پەیدا بکەن، بۆیە تکایان لە حەماڵەکە کرد کە شوێنێکی خەوتنیان پێ نیشان بدات. کە کابرای حەماڵ زانی شوێنی خەوتنیان نییە گوتی:

– ئا، پیرەژنێك لەم نزیکانەیە کە بێگومان داڵدەتان دەدات. ئەم پیرەژنە داماوە، ساڵانێك لەمەوبەر کە هەردوو کوڕەکەی لە دەست دەدات، شارەکەی خۆیان جێدێڵێ‌و دێتە ئێرەو دەبێتە کارەکەریماڵێك. بێگومان ئەو دەتوانێ شوێنێکی خەوتنتان بداتێ.

ئیدی ئەم جووتە دۆستە لەسەر قسەی کابرای حەماڵ دەڕۆن‌و لە دەرکە دەدەن. پیرەژنێك دەرگا دەکاتەوەو لێیان دەپرسێت کە چیان دەوێ. دوو کوڕە لاوەکە تکایان لێکرد کە شوێنێکیان بۆ خەوتن بداتێ. پیرەژن بە میهرەبانی گوتی:

– من لە یەك هۆدە زیاترم نییە. بەڵام ئێوە دەتوانن پەردەیەك لە ناوەڕاستی ژوورەکە هەڵواسن کە نیوەی بۆ ئێوەو نیوەکەی تری بۆ من بێ! دوو دۆستەکە کە زۆر خۆشحاڵ بوو بوون ڕازی بوون‌و چوونە ماڵی پیرەژن. لێ کاتێ کە دوو لاوەکە لەو سەری هۆدەکە جێگیر بوون دیسان دەستیان بە قسان کردەوە، قسەیە لێرەو قسەیەك لەوێ، پریاسکەی دڵیان بۆ یەکدی کردەوەو هەر کەسەو کەوتە گێڕانەوەی سەربورو بەسەرهاتی خۆی بۆ ئەوی دیکە. پیرەژن کە لەو دیوی پەردەکەوە دانیشتبوو، کەوتە گوێ گرتن لە قسەی ئەم دوو لاوە غەریبە. کە ئەوان کەوتنە گێڕانەوەی چیرۆکی ژیانیان، ئەو زیاتر

گوێی هەڵخستو ئەنجام بۆی بە دیار کەوت کە ئەم دوو لاوە لە راستیا هەردوو مناڵە گوم بووەکەی ئەون. پیرەژنی داماو کە خەریك بوو لە خۆشیان دڵی بوەستێ، پەردەکەی لادایە لاوەو هاواری کرد:

– کوڕە ئازیزەکانم، تکاتان لێدەکەم جارێکی دی ئەو حیکایەتەم بۆ بگێڕنەوە کە ئێستا گوێم لێ بوو....

ئیدی هەردوو کوڕە لاوەکە جارێکی دی سەربوری خۆیان بۆ گێڕایەوە. کە پیرەژنەکە بە تەواوی دڵنیا بوو کەئەو دووانە کوڕەکانی ئەون، بە دەم هەڵڕشتنی فرمێسکی خۆشحاڵییەوە گوتی:

– ئا، خودایە، هیچ گومانی تیا نییە کە ئێوە جووتە کوڕە گومبووەکەی منن!

ئەوسا حیکایەتی ونبوونەکەیانی بۆ گێڕانەوە. لەم کاتەدا جووتە برای لاو لە کاتێکا دایکیان لە هەمێز گرتبوو، لە خۆشیا پێیان بەعاردی نەدەکەوت، چونکە لەلایەکەوە دایکە پیرو فیداکارەکەیان دۆزیبووەوەو لەلایەکەی ترەوە بۆیان دەرکەوتبوو کە برای یەکترن!

ئیدی پێکەوەو لەگەڵ دایکیاندا دەستیان بە ژیان کردو ساڵانی ساڵ بە خۆشیو شادییەوە رۆژگاریان بەسەر برد.

## ئەی دۆست!

پیاوێکی قەلەندەر هەبوو کە هەمیشە لە ژیان و وەزع و حاڵی خۆی ناڕازی و خەمبار بوو، چونکە هەرگیز رێنەدەکەوت کە بتوانیٚ ژەمە خواردنێك تێر بەسکی خۆی بخوات و دەستە جلێکی نویٚ و باش لەبەر بکات. رۆژێك لە سوچی چایخانەیەکدا پاڵی دابووەوەو وەنەوزی دەدا، لە پڕ هەوەسی چوونە گەرماوی کەوتە سەرو ئەوجا بەرەو گەرماوی شار وەڕێکەوت. بەڵام ئەوەندە هەژارو بێنەوا بوو حەزی نەدەکرد چاوی بە چاوی خەڵکی بکەویٚ، ئەنجام گەییە گەرماوەکەو خۆی بە ژووردا کرد. پاش ئەوەی خۆی خزاندە سوچێکی چۆڵەوە دەستی بەداکەندنی جلەکانی کرد، لەم کاتەدا، لە یەکێك لە ژوورەکانی گەرماوەکەدا چاوی بە پیاوێك کەوت کە دانیشتبوو و خەریك بوو ئیسراحەتی دەکرد. هەر هەمووان رێزو حورمەتیان دەگرت و دەلاکانی گەرماوەکە بەردەوام لە هاتوچۆدا بوون و چای و شەربەتیان بۆ دێنا تا ماندوویەتی بحەسێتەوە. ئیدی کابرای هەژار کاتیٚ ئەم وەزع و حاڵەی بینی و ئەو پیاوەی لەگەڵ خۆیدا بەراورد کرد زۆر خەمبار بوو و لە فکران راچوو.

جا بە رێکەوت ئەم پیاوە هەژارە زۆر لەو پیاوە دەوڵەمەندە دەچوو، بۆیە کابرای هەژار کاتیٚ بەمەی زانی بیرێکی بە مێشکدا هات و لێبڕا کە کابرای دەوڵەمەند بخاتە خەزینەی گەرماوەکەوەو پاشان خۆی بخاتە شوێنەکەی ئەو. بەم جۆرە کاتیٚ کە کابرای دەلاك، ئەو دەلاکەی کە ماموری پێشوازی کردنی کابرای دەوڵەمەند بوو، بە کارێك رۆیی و کابرا بە تەنیا مایەوە، کابرای هەژار یەکسەر قورتمی کابرای دەوڵەمەندی گرت و پەشتەماڵەکەی کردەوەو ئەوجا بە پەلە فرێی دایە ناو خەزێنەی گەرماوەکەوەو ئیدی پەشتەماڵەکەی ئەوی لە دەوری کەمەری خۆی بەست و لە شوێنەکەی ئەو دانیشت و بەمجۆرە خۆی کرد بەو, لەم کاتەدا کە دەلاکەکە گەڕایەوە، هەرگیز هەستی بەم شتە نەکردو رێزو حورمەتێکی زۆری کابرای هەژاری گرت و بەپەلە کەوتە خزمەتکردن و شۆردنی و پاش ئەوەی کە کابرای هەژار بە سابونی بۆنخۆش و بۆندار خۆی پاك شۆرد، خاولی ئاوریشمینیان تێوە ئاڵاندو ئەوجا بردیان بۆ ئەو ژوورەی کە دەستەیەك خزمەتکار لەویٚ چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەیان دەکرد. لەویٚ خزمەتکاران خێرا هاتنە پیرییەوەو جل و بەرگی گرانبەهاو ئاوریشمینیان لە بەری کابرای هەژار کردو ئەوجا ئەو کیسە پارەیەیان بۆ هێنا کە وەکو بەخشیش بیدات بە دەلاك و ناترەکانی گەرماوەکە. ئەویش بە سەخاوەتەوە سیٚ لیرەی دا بە خاوەن گەرماوەکەو سەرو لیرەشیدا بە هەر خزمەتکارێك و پاش ئەم کارە خزمەتکارەکان تا بەر دەرگای گەرماوەکە بەڕێیان کردو لەوێندەر ئەسپێك بەزین و رەختی جوانەوە چاوەڕوانی دەکرد. خزمەتکارەکانی کڕنۆشیان بۆ بردو بەوپەڕی ئەدەب و حورمەتەوە پرسییان:

– ببورە جەناب، بیٚ ئەدەبی نەبیٚ مەیلتان لێیە سواری ئەسپ ببن؟

کابرای هەژار واقی وڕمابوو، زاتی نەدەکرد کە ئەم پێشنیازە ڕەت بکاتەوە، بەم پێیە سواری ئەسپەکە بوو، و ئەسپەکە کە ڕێگە شارەزا بوو، کەوتە ڕێ، پاش ماوەیەك دوای ئەوەی بە چەند شەقامێکدا ڕەت بوون، سەرەنجام ئەسپەکە لەبەر کۆشکێکی ڕازاوەدا وەستا. خزمەتکارەکان هەموو هاتنە بەرەوەو پاش ئەوەی کڕنۆشیان بۆ بردو یارمەتییاندا لە ئەسپەکە دابەزیو بردیانە ناو کۆشکەکە. لێ کابرای هەژار کە لە تەمەنیدا خانوو و کۆشکی وا جوانی نەدی بوو، لەسەرسامیدا زاری بەش بوو بووەوە، خزمەتکارەکان لێیان پرسی:

– مەیلی جەنابتان ئەوەیە بچنە ژووری خۆتان یان بچنە حەرەم سەرا؟

کابرای هەژار بە دەنگێکی هەندێ لەرزۆکەوە گوتی:

– دەمەوێ بچمە ژوورەکەی خۆم.

بەڵام پاش ئەوەی بردیانە ژوورەکەی خۆی، پاش ماوەیەك هاتنەوەو پرسییان:

– جەناب مەیلتان لێیە لێرە نانی ئێوارە بخۆن یان لە حەرەمسەرا؟

کابرای هەژار وەڵامی دایەوە کە مەیلی لێیە لە ژوورەکەی خۆیدا نان بخوات، ئەوجا لە چاو تروکانێکدا، یەك سینی پڕ لە خواردنی چاكو بەلەزتیان بۆ هێنا. پاش ئەوەی کابرای هەژار شیوی خوارد. خزمەتکارێکی لاوی لێ وەژوور کەوتو پرسی:

– ئەزبەنی حەزتان لێ نییە ئەمشەویش وەکو شەوانی دی سەرێکی حەرەم سەرا بدەن؟

کابرا نەیدەزانی چ وەڵامێك بداتەوە، چونکە نەیدەزانی حەرەمسەرا مانای چییە، بەڵام قیروسیای کردو وەڵامی دایەوە:

– زۆر چاکە، هەر ئێستا دەچم!

ئەوجا خزمەتکارە لاوەکە کڕنۆشێکی بۆ بردوو چووە دەرەوە.

کابرای هەژار کە نەیدەزانی بۆ کوێ بڕواتو چی بکات، بە سەرگەردانی کەوتە گەڕان بە یەك بە یەکی ژوورەکانداو سەرەنجام کە گەییە دوا ژوور، خۆی پێدا کردو ئەوجا لە دەرگایەکی ترەوە چووە حەرەمسەرای ئەم ماڵەوە. شاژنی ئەم حەرەمسەرایە کە ژنێکی جوانو نازدار بوو، هەر کە بینی مێردەکەی بۆ لای ئەو هاتووە، بە خۆشحاڵییەوە لە جێی خۆی هەستاو پیاوەی لای خۆیەوە دانیشاند، لێ کابرای هەژار کە زۆر ترسا بوو، نەیدەزانی ئەم ژنە جوانە کێیەو دەبێ چی پێ بڵێ. ئەنجام ژنە کە تۆزێك گومانی پەیدا کردبوو، گوتی:

– ئۆ ئازیزەکەم، دوێنێ یەکێك لە دۆستەکانم ناوی تۆی لێ پرسیم، ڕەنگە باوەڕ نەکەی کەمن چەند ڕۆژێکە ناوی تۆم لە بیر چووە، تکایە ناوی خۆتم پێ بڵێ، لەوە دەچێ من توشی نەخۆشی بیرچوونەوەو فەرامۆشی بووبم.

لێ کابرای هەژار کاتێ ئەم قسەیەی ژنەوت، نەیدەزانی چ وەڵامێکی بداتەوە، بەڵام زوو بیرۆکەیەکی بە مێشکدا هاتو وا خۆی نواند کە لە ژنەکەی زویرە، وەڵامی دایەوە:

– خۆشەویستەکەم، بە هیچ جۆرێ چاوەڕوانی ئەمە نەبووم لە تۆ، چۆن دەشێت پاش ئەم هەموو ساڵە ناوی منت فەرامۆش کردبێ!

لێ ژنەکە دەستبەردار نەبوو، و کابراش کە زانی تێکەوتووەو هیچ چارێکی دیکەی نییە، هەر ناوێکی بە بیردا دەهات گوتی، بەڵام بۆ نەگبەتی هیچ یەکێك لەو ناوانە دروست دەرنەچوو، بۆیە کابرای هەژار ناچار بوو کە ئیعتراف بە کارەکەی خۆی بکاتو پاشان بە شەرمەزارییەوە گوتی:

- خانمەکەم تکایە بمبووە!

ژنەکە گوێی لەو قسەیە بوو گوتی:

- زۆر چاکە، من دەتبەخشم! بەڵام دەبێ ئەوە بزانی کە مێردەکەی من نەقڵ بێژی پاشا بوو، ئەگەر غوڵامەکانی بە دووتا بنێرێ کە بچی نەقڵی بۆ بگێڕیتەوە چ دەکەی؟

بە ڕێکەوت لە هەمان کاتدا کە ژنە خەریکی قسە کردن بوو، پەیامیان بۆ کابرای هەژار هێنا کە پاشا دەیەوێ بیدینێ. کاتێ کابرای داماو ئەمەی ژنەوت، بە ترسو لەرزەوە بە ژنەی گوت:

- ئێستا چ بکەم. بێگومان پاشا دەستور بە جەلادەکانی دەدات کە لەسەرم بدەن.

کابرا هێندە خەمگینو داماو هاتە بەرچاو, کە ژنە دڵی بە حاڵی سووتاو گوتی:

- من ئێستا فێرت دەکەم کە چ بکەی.. کاتێ چوویتە لای پاشا، دوو مێزی لە بەردەمدایە کە یەکێکیان گەردانەیەکی مرواری و ئەویتریان دارێکی زێڕین-ی لەسەرە، تۆ دەبێ گەردانەکە لە مل بکەیو دارەکە بگریتە دەستەوەو پاشان بچیتە لای پاشاو لەسەر عاردی دابنیشیتو دەست بە گێڕانەوەی نەقڵەکەت بکەی، بەڵام لە بیرت نەچێ کە دەبێ بەم رستەیە نەقڵەکەت دەست پێبکەی: "هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو" پاش ئەوە دەست بە گێڕانەوەی حیکایەتەکەت بکەی!

پاش ئەوەی کە قسەکانی ژنە تەواو بوو، کابرا لەگەڵ خولامانی پاشادا سواری گالیسکە بوو و بەرەو کۆشکی پاشا وەڕێکەوتن، کاتێ گەیینە ئەوێندەر، کابرایان کە زۆر ترسا بوو بردە لای پاشا، ئەویش وەکو چۆن ژنە فێری کردبوو، گەردانەکەی لە مل کردو دارە زێڕینەکەی گرتە دەستو ئەوجا چوارمشقی لە بەردەم پاشادا دانیشتو گوتی:

"هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو....!"

لەپڕ.... کابرای هەژار لە خەو راپەڕی ئاه.... چ شتێ قەوماوە، تومەز هەموو ئەم ڕووداوانە خەون بووە! ئەوجا کابرای هەژار کە بینی هێشتا هەمان جلو بەرگی کۆنو شڕی لەبەرەو لە سووچی هەمان چاخانەی پەڕپووتدا دانیشتووە، ئیدی دڵنیا بوو کە هەموو ئەم شتانەی لە خەودا دیتووەو زۆر خۆشحاڵ بوو و بە دەم بزەیەکەوە هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵکێشاو دووبارە دەستی بە وەنەوزدان کردەوە.

# حیکایەتی شازادەو کیژی نارنج و ترنج

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو لە سەردەمانی کۆندا پاشایەك هەبوو کە لە ڕادەبەدەر دەوڵەمەند بوو, ماڵ و دەوڵەتەکەی لە حیسابا نەبوو. یەکێك لە داب و نەریتەکانی زەمانی حوکمڕانی ئەم پاشا دەوڵەمەندو بەخشندەیە ئەمە بوو کە دەستوری دەدا ساڵانە لە ڕۆژێکی دیاریکراودا, لە جیاتی ئاو, ڕۆن و هەنگوین بە فوارە زۆر و زەبەندەکانی بەردەم کۆشکەکەیدا بڕوات.

ڕۆژێك پیرەژنێکی گەداو داماو کە خەریك بوو بە بەر کۆشکەکەی پاشادا ڕەت دەبوو, گۆزەکەی دانایە سەر زەوی, لێ گاڤێ ویستی لە ڕۆن و هەنگوینی پڕ بکات, کوڕی پاشا کە لەبەر هەیوانی کۆشکدا وێستا بوو، هاواری کرد:

– ئەهای کوڕینە وەرن با تۆزێ ئەم پیرەژنە ئەزیەت بدەین و رابوێرین! ئەوجا تیرێکی لە کەوان ناو گرتییە گۆزەکەی پیرەژن و گۆزەکە لە ناوەندەوە لەت بوو و شکا. پیرەژەنی کلۆڵ کە بە شکانی گۆزەکەی زۆر ناڕەحەت بوو بوو، بە خەیاڵی نیگەران و دڵی شکاوەوە روویکردە کوڕی پاشاو گوتی:

– کوڕەکەم، من چیم کردووە کە گۆزەکەت شکاندم؟ ڕاستە تۆ کوڕی پاشای، بەڵام بڕۆ ئیلاهی ئاشقی کیژی نارنج و ترنج ببی!

دوای ئەو قسە سەیرە لەو ناوە دوور کەوتەوە. کوڕی پاشا کە سەیری بەم قسەیە هاتبوو، قاقایەکی لێداو بەبێ خەمی لەگەڵ دۆستەکانیدا کەوتە گەمەو رابواردن.

شازادە، لەو ڕۆژە بە دواوە ئیدی ئەو لاوە ڕووخۆش و گەشەی جاران نەما. بەرە بەرە لاوازو بێ ڕەنگ دەبوو، پاشا کە هۆی نیگەرانی و ناڕەحەتی کوڕەکەی نەدەزانی، کە بەو حاڵەوە دەیبینی زۆری لەبەر گران بوو، ئەوە بوو ڕۆژێك لێی پرسی:

– کوڕەکەم، ئەوە تۆ چیتە، شتێك هەیە ناڕەحەتت بکات؟

شازادە لە وەڵامی بابیدا تەنیا ئەوەندەی گوت کە بە دڵێك نا بە سەد دڵ ئاشقی کیژی نارنج و ترنج بووەو دەبێ تا زووە بچێتە تاقیب و سۆراخی... ئیدی ئەم کیژە هەر کێیەك دەبێ با ببێ! ئەنجام ڕۆژێك شازادەی لاو مۆڵەتی لە باوکی وەرگرت و پاش خوا حافیزی لە داك و بابی کە زۆر نیگەران بوون، کردو ڕێگەی سەفەری گرتەبەر بۆ دۆزینەوەی کیژی نارنج و ترنج. چەندین ڕۆژی پێچوو، شازادەی لاوە وێڵ و سەرگەردان هەر دەڕۆیی و نەیدەزانی ڕوو بکاتە چ لایەك، ئەنجام ڕۆژێك کە زۆر ماندوو بوو بوو تووشی دەروێشێکی پیر بوو، کابرای دەروێش کە ئەم لاوە خەمبارەی بینی پرسی:

– کوڕەکەم زۆر خەمبار دیاری، دەتوانی پێم بڵێی لەبەرچی ئەوەندە خەمباری؟

شازادە لە وەڵامی دەروێشدا گوتی کە شێتو شەیدای کیژی نارنجو ترنج بووە، قەرارو ئۆقرەی لەبەر براوە، بەڵام نازانێ کە ئەم کیژە کێیەو لە کوێ دەژیو بە کورتییەکەی دەبێ لە کوێ بۆی بگەڕێ. کابرای دەروێش ماوەیەك لە فکران چوو سەرەنجام گوتی:

– ڕەنگە کیژێك بەو ناونیشانە هەبێ، ئێستا شوێنێکت نیشاندەدەم کە لەوەیە بتوانی لەوێندەر بیدۆزیتەوە... لەودیو ئەو کێوە بەرزانەوە باخێکی گوڵان هەیە کە هەموو باخەکە بە پەرژینی دڕك دەورە گیراوە. تۆ دەبێ بچیتە ناو ئەم باخەوەو یەکەم کارێك کە بیکەیت ئەمەیە کە لقە گوڵە باخێك بکەیتەوەو بۆنی پێوە بکەیو بە دەنگی بەرز بڵێی: "چ گوڵستانێکی جوانە"و پاش ئەوەی ئەم کارەت کرد، کەمێ دەچیتە سەرووترو تووشی ڕووبارێك دەبیت، کە گەییشتیە ئەوێندەر بە دەنگی بەرز بڵێی: "بەهبەهـ چ ئاوێکی زوڵاڵو سازگارە". دیسانەوە کەمێ لەولاترەوە تووشی سەگێكو ئەسپێك دەبیت، کە مشتێ جۆ لەبەر سەگەکەیەو کۆمەڵێك ئێسقان لەبەر ئەسپەکەیە، ئەوەی لەسەرتە بیکەی ئەوەیە کە جێی ئەم دووە بگۆڕی، واتە جۆیەکە بکەیە بەر ئەسپەکەو ئێسقانەکان بکەیە بەر سەگەکە. لەو بەولاوە دوو دەروازە دێتە ڕێت، یەکێکیان کراوەتەوەو ئەویتریان داخراوە. تۆ دەبێ کراوەکەیان دابخەیتو داخراوەکەیان بکەیتەوەو ئەوجا لێوەی وەژوور بکەوی، لەوێوە دەچییە ناو باخێکی گەورەی دیکەوە کە ئەم باخە هی دێوێکە. لەم باخەدا درەختێکی نارنجو ترنج هەیە کە تەنیا سێ نارنجو ترنجی پێوەیە تۆ دەبێ لە لقەکەیان بکەیەوەو ئەوجا بە پەلە لە باخەکە وەدەر بکەوی، ئەوجا دەگەیە ڕووبارێك، ئیدی لەوێ دەتوانی نارنجەکان لەت بکەی، کە ئەمەت کرد ئیدی لە هەر یەکێکیانەوە کیژێك دێتە دەرێ کە هاوار دەکات: "ئاو ئاو"و ئەگەر نەیگەیەنیتە ئاوەکە، دەمو دەست دەمرێ!.

شازادە کە ئەم حیکایەتەی ژنەفت ئاخیری ڕێگەی درەختی نارنجو ترنجی دۆزییەوە، زۆر سوپاسی کابرای دەروێشی میهرەبانی کردو دەستەکانی ماچ کردو ئەوجا بەرەو ئەو ئاقارەی کە دەروێش نیشانی دابوو کەوتە ڕێ، پاش ماوەیەك کە هەر ڕۆییو ڕۆییو بە هەورازو نشێواندا هەڵگەڕاو داگەڕا، گەییە باخێکی گوڵەباخان، لەم کاتەدا هەروەکو دەروێشەکە گوتبووی، گوڵە باخێکی بە چڵەکەیەوە لە نێو دڕكو داڵاندا کردەوەو بەدەم بۆنکردنیەوە گوتی:

– چەند گوڵستانێکی جوانە!

پاشان کەوتە ڕێو لەولاترەوە گەییە ڕووبارێك و وەکو چۆن دەروێشەکە فێری کردبوو چۆڕێکی لە ئاوەکە خواردەوەو گوتی:

– بەهبەهـ چ ئاوێکی زوڵاڵو سازگارە!

دیسان بەرەو پێشێ ڕۆیی تا گەییە سەگێكو ئەسپێكو بە گوێرەی قسەکەی دەروێش پاش ئەوەی جۆیەکەی کردە بەر ئەسپەکەو ئێسقانەکانی لەبەر سەگەکە دانا، درێژەی بە ڕێگەداو لەم کاتەدا گەییە دوو دەروازە کە یەکێکیان داخرابوو و ئەویتریان کرا بووەوە، وەکو

چۆن دەروێش گوتبووی، دەرگا کراوەکەی داخستو ئەویتری کردەوەو وەناو باخێکی گەورە کەوت... ئیدی بە پەلە بەرەو دار نارنجەکە رۆیی و سێ نارنجی کردەوە، بەڵام ڕێك لەو دەمەدا کە دەیویست لە باخەکە وەدەرکەوێ دێوی خاوەن باخ کە ئەوی دیتبوو تێی خوڕی:

– بیگرە، دەروازە بیگرە!

لەم کاتەدا دەروازەی یەکەم وەڵامیدایەوە:

– من نایگرم، من ساڵانێك بوو کراوە بوومو کەس داینەدەخستمو هەر ئەم بەهانامەوە هاتوو گرتمی، من نایگرم!

دەروازەی دووەمیش وەڵامی دایەوە:

– من ساڵانی ساڵ بوو کە داخرابووم, ئەدی تۆ قەولت نەدا بوو کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بمکەیتەوە، بەڵام ئەو کردمیەوە، بۆیە من هەرگیز نایگرم!

ئەوجا دێوەکە بە توڕەیی رووی کردە سەگو ئەسپەکەو هاواریکرد:

– بیگرن، ئەو زەلامە بگرن!

ئەسپەکە وەڵامی دایەوە:

– ئەو جۆیەکەی کردە بەرمو لە برسیەتی رزگاری کردم، بۆیە من هەرگیز ئەو ناگرم!

سەگەکە گوتی:

– من نایگرم, چونکە خواردنی دامیۆ لە برسییەتی رزگاری کردم!

دێوەکە زۆر توڕە بوو و بە روبارەکەی گوت:

– ئەی رووبار غەرقی بکە، ئەو زەلامە غەرق بکە.

رووبارەکە وەڵامی دایەوە:

– من غەرقی ناکەم، چونکە ئەو ئاوی لێخواردمەوەو گوتی: چ ئاوێکی زوڵاڵو سازگارم هەیە، بەڵام تۆ تا ئێستا هەرگیز قسەیەکی وات نەکردووە، هەمیشە دەتگوت ئاوێکی لێخنم هەیە، من هەرگیز ئەو غەرق ناکەم!.

ئەنجام دێوەکە پەنای وەبەر دوا شانسی خۆی بردو لە کاتێکا لە توڕەییدا ئاور لە چاوانییە دەردەپەڕی بە باخی گوڵانی گوت:

– بیگرە!

بەڵام باخەکە وەڵامی دایەوە:

– ئەو لە دڕو پەرژینی من نەترساو گوڵێکی کردمەوەو بۆنی کرد، کەواتە دڵنیابە من هەرگیز نایگرم!

لەم کاتەدا دێوەکە کە خەریك بوو لە توڕەییدا دەتەقی کەوتە غاردان بە دووی شازادەدا، لێ کاتێ گەییە رووبارەکە، روبار گرتیو غەرقی کردو بەمجۆرە شازادەی لاو لە دەستی دێوی ناڕەسەن رزگاری بوو. کاتێ شازادە بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە لە باخەکە وەدەرکەوت،

**هێشتا زۆر لەوێ دوور نەکەوتبووەوە کە کەڵکەڵەی ئەوەی کەوتە سەر کە یەکێك لە نارنجەکان بشکێنێ.**

**ئیدی یەکێك لە نارنجەکانی دەرهێناو لە ناوەڕاستەوە شەقی کرد، لە پڕ کیژۆڵەیەك لە ناوەندی نارنجەکەوە هاتە دەرێ و هاواری کرد:**

**– ئاو، ئاو**

**بەڵام شازادە هەر چەند ئەملاو ئەولای کرد، ئاوی لەو ئاقارەدا بەدی نەکرد تا کیژۆڵەکە بگەیەنێتە ئاو، کیژۆڵەی داماو وەکو گوڵێك سیس بوو و خێرا مرد، شازادە ئەم رووداوەی زۆر لەبەر گران بوو و لێبڕا تا نەگاتە سەرچاوەیەك ئەم کارە دووبارە نەکاتەوە، بەڵام پاش ماوەیەك رێکردن دووبارە کەڵکەڵەی کەوتەوە سەرو بە خۆی گوت:**

**– چۆنە بزانم کە ئاخۆ ئەم دووەی تر هیچیان تێدایە یان نا؟ دیسان یەکێك لە نارنجەکانی شەق کردو هەمدیس کچۆڵەیەکی لێهاتە دەرێ بەڵام ئەویش وەکو کیژۆڵەی یەکەم پاش ماوەیەکی کورت هەڵوەری و مرد.**

**شازادە زۆری گلەیی لە خۆ کردو بڕیاریدا تا نەگاتە سەرچاوەیەکی ئاو دوا نارنج شەق نەکات. ئەنجام بەدەم رێکردنەوە گەییە سەرچاوەیەکی پڕ ئاو لەوێ و لە پاڵ سەرچاوەکەدا دانیشت و دوا نارنجی شەق کرد، لەم کاتەدا کچۆڵەیەك لە نارنجەکەوە هاتە دەرێ و شازادە خێرا لە ئاوەکەی نا، کچۆڵەکە پاش ماوەیەك مەلەو ئاو خواردنەوە لە ئاوەکە هاتە دەرێ و لە پاڵ شازادەدا دانیشت... کیژۆڵەیەکی زۆر جوان بوو وەکو مانگی چواردە دەدرەوشایەوە... ئازادەی لاو کە زۆر ئەفسوونی جوانی ئەم کیژۆڵە خشکۆکە بوو بوو، هەستیدەکرد، ئێستا سەد هێندەی جاران شەیداو ئاشقی بووە. لە خۆشی ئەوەی کە کیژی نارنج و ترنجی دۆزی بووەوە لە پێستی خۆی نەدەهێوری لەم کاتەدا بە کیژێی گوت:**

**– رێگە دەدەی کە من بۆ کۆشکەکەی خۆم بگەڕێمەوەو سەربازەکانم بۆ ئێرە بێنم، تا ئەوان تا کۆشکەکەی بابم لەگەڵتابن و پاشان لەوێ بە رەزامەندی بابم زەماوەند بکەین.**

**کیژۆڵەکە وەڵامی دایەوە:**

**– هەڵبەتە رێگەت دەدەم، بەڵام دەبێ شتێکت لە بیر بێ، ئەویش ئەوەیە کە گەییتە کۆشك رێگە بە هیچ کەس نەدەی نێوچەوانت ماچ بکات، چونکە ئەوسا من لە بیر دەکەی و ئیدی هەرگیز من نابینییەوە.**

**شازادە قەولی دایێ و ئەوجا بە پەلە بەرەو شارو کۆشکەکەی بابی وەڕێکەوت، کاتێ شازادە**

**گەییە کۆشکی بابی، دایك و بابی کە زۆریان غەریبی کردبوو، هێندە بە دیتنی خۆشحاڵ بوون کە بەغار هاتنە پێشوازی و لە هەمێزیان گرت و ئەویش بۆ دەمێك ئەوەی لەبیر کرد کە چ بەڵێنێکی بە کچۆڵەکە دابوو، لەم کاتەدا وەختێ بابی نێوچەوانی ماچ کرد، لە پڕ شازادە هەموو سەربوری کیژی نارنج و ترنج و ئەشقی خۆی سەبارەت بەو فەرامۆشکرد... لەوە بەولاوە، کیژۆڵەکە کە لە قەراخ سەرچاوەکە چاوەڕوانی گەڕانەوەی شازادەی دەکرد، هەر**

چەندی چاوەڕوان کرد هیچ هەواڵێك لە شازادەوە نەبوو، ئیدی بەدەم خەمو پەژارەیەکی زۆرەوە چووە ژێر درەختێك و پێی گوت:

– ئەی درەخت، لقەکانت شۆڕبکەوە تا من بتوانم لەسەر تۆ دانیشم! درەختەکەش کە دڵی بە حاڵی کیژۆڵەکە سوتا بوو، خۆی دانەواندەوەو کچەکە سەرکەوتە سەر درەختەکەو لەسەر یەکێك لە لقەکان بە دەم چاوەڕوانی شازادەوە دانیشت. لە کاتێکا بەسەر دارەکەوە بوو وێنەکەی لە ئاوەکەدا عەکس بوو بووەوە.

ماڵێك لەو دەوروبەرانە بوو، کەنیزەکێکی زنجییان هەبوو، رۆژێ کە کەنیزەکەکە بۆ ئاو بردن هاتبووە سەر کانییەکە، دەبینێ کە وێنەی کیژێکی یەجگار جوان لە ئاوەکەدایە. بەوپەڕی سەرسامی بە خۆی دەڵێت:

ئاه، من ئەوەندە جوان بوومو بە خۆم نەزانیوە. کەواتە ئەگەر من ئەوەندە قشتم، بۆچی خانم هەمیشە بۆ ئاو بۆ ئەم شوێنە دوورەم دەنێریو ئەوەندە ئەزیەتم دەدات. من ئیدی نابێ کار بکەم! ئیدی گۆزەکەیدا بە زەویداو شکاندیو بەرەو ماڵ گەڕایەوە!

کاتێ خانمی کەنیزەکەکە ئەم قسەیەی گوێ لێبوو، بە تەوسەوە گوتی:

– جوان، قسەی قۆڕ، بچۆوە لای کانییەکەو ئەمجارە بە وردی سەیری خۆت بکە!

کەنیزەکە کە دیسان چووەوە بۆ سەر کانییەکە، لێ ئەمجارە کاتێ سەری هەڵبڕی لە پڕ چاوی بە کیژێکی یەجگار جوان کەوت بەسەر درەختەکەوە، هەمان کیژی نارنج و ترنج بوو و بۆی دەرکەوت کە تومەز ئەمە وێنەی ئەوە لە ئاوەکەدا، ئەوجا چووە ژێر درەختەکەو گوتی:

– ئاه، خانمی نازدار تۆ چۆن چوویتەتە ئەو سەرە، رێم دەدەی منیش بێمە لات.

کیژی نارنج و ترنج کە لە چاوەڕوانی شازادە بێتاقەت بوو بوو و لە تەنیایی وەڕز بوو بوو، خۆشحاڵ بوو کە دەیتوانی لەو تەنیاییەدا هاودەمێکی وەکو ئەم کەنیزەکەی لەگەڵدا بێ، بۆیە بە درەختەکەی گوت:

– ئەی درەخت لقەکانت شۆڕ بکەوە

ئیدی کەنیزەکە کە سەرکەوتە سەر درەختەکەو لەگەڵ کیژی نارنج و ترنجدا کەوتە قسان و کاتێ کیژی نارنج و ترنج هەموو بەسەرهاتی خۆی بۆ کەنیزەکە کە باس کردو ئەنجام گوتی کە چاوەڕوانی هاتنی شازادەیە، کە نیزەکە کە لێی پرسی:

– رازو نهێنی بوونی تۆ لە چیدایە؟ نیشانەی تەلسمی تۆ چییە؟ کیژی نارنج و ترنج وەڵامی دایەوە:

– ئەم تەلیسمە لەو تەوقەیەدایە کە لە قژم داوە هەر کاتێ ئەم تەوقەیە لەسەرم بکەوێ، من یەکسەر دەبم بە باڵندەیەك. کەنیزەکە رەشەکە کە گوێی لەم قسەیە بوو، لە پڕ بیرێکی خراپ بە مێشکیدا هات و بەنیاز خراپییەوە گوتی:

– ئەی خانمی نەشمیل، رێم دەدەی تەنیا یەکجار، یەکجار جلە جوانەکانی تۆ لەبەر بکەمو خشڵ و زیوەکانت بە خۆمدا بکەم، پێت وا نییە ئەگەر منیش ئەم جلانە لەبەر بکەم وەکو تۆ جوان ببم؟.

کاتێ کیژی نارنج و ترنج، کە کیژێکی زۆر دڵپاك و سادە بوو، گوێی لە تکاکەی کەنیزەکە کە بوو، خێرا جلە ئاوریشمە گرانبەهاکانی داکەندو کردییە بەر کەنیزەکەکەو پاشان گەردانەکەی خۆی لە ملی ئەو کرد، پاش ئەوەی کەنیزەکەکە جلەکانی لەبەر کرد بە کیژەی گوت:

– سەرت دابنەوێنە دەمەوێ قژت شانە بکەم!

ئەوجا کیژی نارنج و ترنج سەری دانەواندو کەنیزەکەی حیلەباز کەوتە شانەکردنی قژی. بەڵام لەو کاتەدا کە کەنیزەکی ناڕەسەن بە جۆرێ کە کیژی نارنج و ترنج هەست نەکات، تەوقە ئەفسووناوییەکەی لەسەری کردەوەو لە پڕێکاو کیژەی جوان و نەشمیل بوو بە باڵندەیەکی بچووکی جوان و کەوتە فڕین بە ئاسماندا و لە چاو ون بوو. ئیدی کەنیزەکی حیلەباز بە جلەکانی کیژی نارنج و ترنجەوە، لەسەر درەختەکە چاوەڕوانی شازادەی دەکرد.

دوای چەند رۆژێك شازادە لەپڕ هەموو بەسەرهاتی کیژی نارنج و ترنجی بیرکەوتەوەو لەگەڵ سەربازان و دەست و پێوەندەکانیدا چوون بە شوێنی کیژێدا، کاتێ کەنیزەکەکە بەسەر دارەکەوە گوێی لە دەنگی تەپڵ و شەیپوران بوو، بە خۆشحاڵییەوە دەستیدا بەیەکداو گوتی:

– ئەها! ئەوانە هاتوون کە من لەگەڵ خۆدا ببەن!

لێ کاتێ شازادە کە گەییە کانییەکەو ژێر ئەو درەختەی کە کەنیزەکەکەی بەسەرەوە بوو، چەند دەمێك بەسەرسامی روانییە کەنیزەکە رەشەکەو ئەنجام گوتی:

– ئازیزەکەی دڵم چی روویداوە کە ئەوەندە گۆڕاوی! کەنیزەکەکە بە زیرەکی وەڵامی دایەوە:

– هەتاو رەشی کردووم و با رەنگ و رووی بردووم! من دەترسام کە تۆ منت لە بیر کردبێ و ئیدی هەرگیز بۆ لای من نەگەڕێیتەوە بۆیە ئەوەندە گریاوم چاوانم تاریك و لێڵ بوونە!

شازادە کە باوەڕی بە چیرۆك و بەسەر هاتی کەنیزەکە رەشەکە کردبوو، لە دارەکەی هێنایە خوارێ و هەڵدایە تەرکی ئەسپەکەی خۆی و بەرەو کۆشکەکەی بابی وەڕێکەوتن. لێ کاتێ گەیینە ئەوێندەرو داك و بابی شازادە چاویان بەو قەرەواشە ناشیرینە کەوت هاواریان کرد:

– ئەی خودا، ئەمە ئەو کچەیە کە تۆ ئاشقی بوویت! بەڵام چ دەکرا... سەرەنجام ئاهەنگێکی گەورە بەرپا کراو کەنیزەکە رەشە بوو بەژنی شازادە.

ئێستا با بێینەوە سەر کیژی نارنج و ترنج، بۆ سبەینێ و رۆژانی دی، هەموو رۆژێك کۆترێکی بچکۆلەی سپی کە کیژی نارنج و ترنجی داماو بوو، دەهاتە باخی کۆشك و لەسەر درەختێك دەنیشتەوەو دەستی بە خوێندن دەکردو بە باخەوانەکەی دەگوت:

– ئەی باخەوانی میهرەبان، ئەگەر شازادە خەوتووە، ئیلاهی خەوی خۆش و شیرین بێ، بەڵام ئەگەر کەنیزەکە رەشە خەوتووە ئیلاهی خەوی مەرگی بێ!..

لێ کاتێ باڵندەی نێوبراو لەو قسانە دەبووەوەو لە شەقەی باڵی دەداو لەو ناوە دوور دەکەوتەوە، لەپڕ ئەو لقەی باڵندە جوانەکەی لەسەر نیشتبووەوە وشك دەبوو و هەموو

گەڵاکانی دەڕژایە سەر زەوی. تا ڕۆژێك شازادە کە لە نێو باخەکەدا خەریکی گەڕان بوو، لە پڕ چاوی بە درەختێك کەوت کە هەموو لقەکانی وشك بوو بوون، باخەوانەکەی گاز کردو بە تووڕەیی لێی پرسی:

– بۆ ئاگاداری ئەم درەختە ناکەیت، هەموو لقەکانی وشك بووە.

باخەوانەکە کە زۆر ترسا بوو چیرۆك و حیکایەتی باڵندە چکۆلەکەی لە نووکەوە بۆ شازادە باس کردو گوتی هەموو ڕۆژێك باڵندەیەکی چکۆلە دێتە باخەکەوە لەسەر لقەکانی ئەم درەختە دەنیشێتەوە.

شازادە کە ئەمەی بیست زۆری سەیر لێهات و دەستووری دا کە هەموو لقەکانی ئەم درەختە قیروزفت بکەن تا بتوانن ئەم باڵندەیە بگرن و سەر لەکاری دەربێنن.

بۆ سبەینێ باخەوانەکە بە گوێرەی دەستووری شازادە، هەموو لقەکانی درەختی گۆڕینی بەقیروزفت سواغ داو چاوەڕوانی هاتنی باڵندە چکۆلەکە بوو، باڵندەکە وەکو جاران سوڕێك بەسەر باخەکەدا خولایەوەو هات لەسەر هەمان درەخت نیشتەوەو دەستی بە خوێندن کرد...

بەڵام کاتێ لە خوێندن بووەوەو ویستی هەڵفڕێ، لاقەکانی لە قیرو زفتەکە چەقی بوون، باخەوانەکە چوو گرتی و بۆ لای شازادەی برد، شازادە کە تەواو دڵبەندو شەیدای ئاوازو قسە جوانەکانی ئەم باڵندە جوانە چکۆڵەیە بوو بوو، دەستووریدا قەفەزێکی زێڕ بو ئەم باڵندەیە دروست بکەن و لە ژوورەکەی ئەو هەڵیواسن، کاتێ باڵندە چکۆلەکە ئەم قسەیەی ژنەفت بە خۆشحاڵییەوە باڵەکانی بە یەکدا داو کەوتە نەغمەخوانی.

بەمجۆرە ئەم باڵندە جوانە لە قەفەزێك نراو قەفەزەیان لە ژووری شازادە هەڵواسی.

بەڵام کاتێ کەنیزەکی فێڵباز چاوی بە باڵندەکە کەوت، زۆر حەسوودی پێبردو هەردوو پێی کردە تاکێ کەوشەوەو دەستووریدا کە ئەم باڵندەیە سەر ببڕن و گۆشتەکەی بۆ ببرژێنن. لێ شازادە کە بەمە غەمبار بوو بوو گوتی:

– تۆ نابێ ئەم کارە بکەی، خۆ ئەگەر هەر سووری لەسەر ئەمە، ئەوا من دەستوور دەدەم کە باڵندەیەکی دیکەت بۆ بگرن.

لێ ئەم قسەیە بە گوێی کەنیزەکەدا نەچوو گوتی:

– نا، من دەمەوێ گۆشتی ئەم باڵندەیە بخۆم.

ئەنجام شازادە کە گەلەك خەمین بوو بوو، دەستووریدا ئەم باڵندەیە بەرن و سەری ببڕن.

بەڵام پاش چەند ڕۆژێك، ڕێك لەو شوێنەداکە چەند دڵۆپە خوێنێکی ئەم باڵندە سپییەی بەسەردا ڕژابوو، دار سەروویەك ڕووا، کە زۆر زوو گەشەی کردو بوو بە درەختێکی زەلام.

ئەمجارەش کاتێ کەنیزەکەکە چاوی بەم درەختە کەوت، هاواری کرد کە دەبێ ئەم دارە ببڕێتەوەو بێشکەیەکی بۆ ساواکەی لێ دروست بکەن. دیسان شازادە دەستووریدا کە دارەکە ببڕنەوەو لانکەیەکی لێ دروست بکەن. خزمەتکارانی پاشا بە گوێرەی دەستوورەکەی ئەو دارەکەیان بڕییەوەو پارچە پارچەیان کرد تا بێشکەیەکی لێدروست بکەن.

لەم کاتەدا پیرەژنێکی هەژار کە خەریك بوو بە بەر کۆشکەکەی پاشادا رەتدەبوو، تکای کرد کە چەند پارچەیەکی لەو دارانە بدەنیّ و گوتی:

- ئەریّ دەکریّ چەند پارچەیەکم لەو چیلکەو دارانە بدەنیّ بۆ خۆم ئاگری پێدەکەمەوە؟

شازادە بە سەخاوەتەوە دەستووریدا کە هەندیّ لەو دارانەی بدەنیّ. پیرەژن دارەکانی هێنایەماڵەوەو لە ئاشخانەی ماڵەکەیدا دایناو ئەوجا دەرکەی ماڵەکەی داخستو بۆ بازاڕ رۆیی. بەڵام وەختیّ پیرەژن لە ماڵ وەدەرکەوت، لە پڕ کیژی نارنج و ترنج لە نێو پارچە دارەکانەوە هاتە دەریّ و کەوتە گسك دان و خاوێن کردنەوەی ماڵەکەی پیرەژن و پاش ئەوەی خواردنێکی بەتام و لەزەتی لەسەر وەجاخەکە دروست کرد، جارێکی دی چووەوە ناو پارچە دارەکان، وەختیّ پیرەژن بۆ ماڵ گەڕایەوە لەسەرسامیدا هاواری لێهەستاو نەیدەتوانی باوەڕ بە خۆی بکات کە ئەمە هەمان ماڵەکەی خۆیەتی... ماڵەکە لە تەمیزیدا دەبریقایەوە، هەموو شوێنێکی پاك و رێكوپێك بوو. خودایە چی روویداوە؟ خولاسە پیرەژن چەندی بیرکردەوە ئەقڵی بە هیچ کویّ را نەگەیی.

سەرەنجام وەختیّ هاتە ئاشخانەکەوەو بینی مەنجەڵی خواردنەکەی قوڵپە قوڵپ دەکوڵیّ، خەریك بوو شێت دەبوو و گوتی:

- تۆ هەر کەسێك هەی بە خوا سوێندت دەدەم کە خۆتم نیشانبدەی ئایا تۆ جنی یا ئادەمیزادی؟

لەم دەمەدا لەپڕ کیژی نارنج و ترنج لەنێو چیلکەو دارەکانەوە هاتە دەریّ و پاش ئەوەی دەستی پیرەژنی ماچ کرد هەموو سەربورەکەی خۆی لە نووکەوە بۆ گێڕایەوەو ئەوجا تکای لێکرد کە بە کیژی خۆیی قەبووڵی بکات.

کاتیّ پیرەژن گوێی لەم حیکاتە بوو لە ناخی دڵەوە کیژی نارنج و ترنجی بە فەرزەندی قەبووڵ کردو بەم شێوەیە کیژی نارنج و ترنج دەستی بە ژیان لە ماڵی پیرەژندا کردو لە کاروباری ماڵەوەدا کۆمەکی دەکرد.

پاش ماوەیەك، رۆژیّ جارچییانی شا کەوتنە ناو شارو هەواڵیان بڵاوکردەوە کە شازادە زۆر نەخۆشەو لوقمان و حەکیمان گوتوویانە کە پێویستی بە شێوێکی تایبەتییە تا چاك ببێتەوە...

ئیدی لەسەرانسەری مەملەکەتدا هەر کەسەو هەر شیوێك-ی زانیبوو دروستی کردبوو و بۆ کۆشکی شازادەیان ناردبوو، لیّ شازادەی نەخۆش وێڕای ئەوەی کە ئەم شێوانە زۆر چاك لێنرابوون لە هەر یەکەیان تاقە کەوچکێکی خواردبوو و ئەویتری بۆ ئاشخانە ناردبوو. تا رۆژێك کە کیژی نارنج و ترنج ئەم هەواڵەی بیست بوو، بە پیرەژنی گوت:

- دایکە گیان، رێگەم بدە با منیش تۆزێك لە جۆرە شیوێك کە دەیزانم دروست بکەم و بۆ کۆشکی بنێرم!

پیرەژن وەڵامی دایەوە:

- باشە چ قەیدییە کیژی ئازیزم, کێ دەزانێ لەوەیە ئەمجارە شازادە پەسندی بکات‌و بیخوات‌و بەویست‌و ئیرادەی خوا چاك ببێتەوە!

بەمجۆرە کیژێ دەست بەکار بوو و هەندێکی لەو شێوە تایبەتییە لێنا کە بۆ چاری نەخۆشییەکەی شازادە پێویست بوو، پاش ئەوەی چێشتەکەی کردە کاسەوە، ئەو موستیلەی کە شازادە لەسەر کانییەکە کردبوویە قامکی، داکەندوو خستییە ناو چێشتەکەوە. ئەوجا کاسەکەی دایە دەست پیرەژن تا ببیات بۆ کۆشك.

لێ کاتێ پاسەوانی بەر دەرگای کۆشك بینی پیرەژنێکی هەژار قاپێ چێشتی بۆ شازادەی نەخۆش هێناوە، ڕێگەی بە پیرەژن نەدا وەژوور کەوێ‌و لەو ناوەی دەرکرد، لەم کاتەدا شازادە کە لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە ئەم دیمەنەی بینی بوو، دڵی پێ سووتا بوو و دەستوور دەدا کە ڕێگە بە پیرەژنی هەژار بدرێ بێتە ژوورەوە. ئیدی غوڵامانی شازادە پیرەژن دەبەنە حوزووری شازادەو ئەویش قاپە چێشتەکەی لەبەردەم شازادە دا دانا.

شازادە کە نەیدەویست دڵی پیرەژن بشکێنێ. مراکێکی لەم چێشتە خوارد، چێشتەکەی زۆر بەلاوە بەلەزەت بوو, بۆیە بۆ جاری دووەم مراکەکەی بە چێشتەکەدا کرد کە لەم دەمەدا لە پڕ.... چاوی بەو موستیلەیە کەوت کە بە خۆی بە کیژی نارنج‌و ترنجی بەخشی بوو و بە سەرسامی لە پیرەژنەکەی پرسی:

- دایکە تۆ هیچ کچت لە ماڵەوە هەیە؟

پیرەژن گوتی:

- بەڵێ شازادە، ئایا ئەمرێکت پێی هەیە؟

شازادە گوتی:

- گوێبگرە دایە، تۆ دەبێ سبەی عەسر لەگەڵ کیژەکەتدا بێنە بەر هەیوانی ژوورەکەی من، من یەك سەبەتە زێڕت لەبەر هەیوانی ژوورەکەمەوە بۆ ڕادەهێڵم و تۆش کە زێڕەکانت هەڵگرت، دەبێ لە جیاتی ئەوە کیژەکەی خۆت بخەیتە سەبەتەکەوە، واتە لەبری ئەو زێڕانە کیژەکەت بەمن ببەخشی.

پیرەژن کڕنۆشێکی بردو گوتی:

- بەسەر چاوم هەر چییەك قیبلەی عالەم بفەرموێ وا دەکەم، سبەی عەسر کیژەکەم دێنمە ئێرە.

وەختێ پیرەژن لە کۆشکەکە هاتە دەرێ، بە خۆشحاڵییەوە بەرەو ماڵ بووەوەو ئەوجا حاڵ‌و حیکایەت‌و داواکەی شازادەی بۆ کیژێ گێڕایەوەو هەردووکیان بە خۆشحاڵییەوە چاوەڕوانی هاتنی سبەینێیان کرد، سبەینێ پیرەژن لەگەڵ کیژەکەیدا دەچێتە ژێر هەیوانی کۆشکەکەی شازادە، کە شازادە سەبەتە زێڕەکەی ناردە خوارەوە، پیرەژن زێڕەکانی هەڵگرت‌و کیژەکەی لە سەبەتەکە نا. کاتێ شازادە سەبەتەکەی هەڵکێشایە سەرێ‌و چاوی بە دڵدارەکەی کە هەمان کیژی نارنج‌و ترنج بوو، کەوت هەردووکیان بە خۆشحاڵییەوە یەکیان لە هەمێز گرت‌و پاشان دوای ئەوەی شازادە گەییە دڵدارە ڕاستەقینەکەی خۆی یەکسەر

نەخۆشییەکەی پەڕیو ئەوسا زەماوەندێکی گەورەیان بۆ گێڕان. شازادە دوای ئەوەی زانی ئەم کەنیزەکە رەشە نارەسەنە نێرەنگبازە ئەو هەموو کارەی کردووە، زۆر توڕە بوو دەستووریدا کە پرچەکەی بە کلکی چل ئەسپی کێوییەوە ببەستن و ئەوجا بەرەڵلای کێوانیان بکەن تا بەمجۆرە بە سزای تاوانی خۆی بگات. ئەوجا شازادە کیژی نارنج و ترنجی خواست و سالەهای سالْ بەخۆشحاڵی و میهرەبانییەوە رۆژگاریان بەسەربرد، حیکایەتەکەیان لێرەدا تەواو بوو.... بە ئومێدی خۆشی بۆ ئەوان و سەلامەتی بۆ ئێمە هەمووماں.

# مرواری کەسك

یەکیٚ بوو یەکیٚ نەبوو، کەس لە خوا گەورەتر نەبوو. لە رۆژگارانی کۆندا بازرگانێك هەبوو کەسیٚ کیژی هەبوو. رۆژێك ئەم بازرگانە کە بە نیازی سەفەر بوو، کیژەکانی بانگ کردو پێی گوتن کە حەزیان لە چییە تا لە سەفەرەکەی بەدیاری بۆیان بێنیٚ، کیژی یەکەم داوای جووتیٚ گوارەی ئەڵماسی کرد، کیژی دووەم داوای لە بابی کرد کە تەوقەیەکی ئەڵماس نیشانی بە دیاری بۆ بێنیٚ، کە نۆرە هاتە سەر کیژی سێیەم بە بابی گوت کە حەز دەکات "مرواریيەکی کەسکی" بە دیاری بۆ بێنیٚ. پاشان بە دەنگێکی سەیر لە سەری رۆیی:

– باوکە گیان ئەگەر نەتوانی ئەو شتەی کە من داوام کردووە، بۆم بێنی، ئیدی هەرگیز ناگەڕێیتەوە ئەم ماڵە.

بابی کە گوێی لەم قسەیە بوو کەمێك ترساو لە فکران راچوو، بە هەر حاڵ کاتیٚ چووە سەفەرو وەختی گەڕانەوە هات، ئەو گوارەو تەوقە ئەڵماسەی، کە کیژی یەکەمو دووەم داوایان کردبوو، کڕی. لیٚ هەر چەند گەڕا نەیتوانی (مرواری کەسك) بۆ کیژی سێیەم پەیدا بکات. ئەنجام بارەکانی لە کەشتییەك بارکردو ویستی بۆ شارەکەی خۆی بگەڕێتەوە، لیٚ کاتیٚ کەشتییەکە ویستی بکەوێتە ریٚ، لە پڕ ڕێگەی دەریا گیراو ئیدی کەشتییەکە نەیتوانی بکەوێتە ریٚ. کەشتیوانەکە هەر چەندی روانییە ئەملاو ئەولا هیچی لیٚ حاڵی نەبوو و ئەنجام هاتە ناو رێبوارانی کەشتییەکەو گوتی:

– نەفەرێکتان بەڵێنێکی داوە کە دەبیٚ بەڵێنەکەی بباتە سەر دەنا کەشتییەکەمان هەرگیز ناکەوێتە ریٚ.

لەبەر ئەمە کابرای بازرگان، کەشتییەکەی بەجێهێشتو دووبارە کەوتەوە گەڕان بە دوای "مرواری کەسك"داو بەدەم رێوە تووشی پیاوێکی حەکیم بوو، کاتیٚ پرسیاری "مرواری کەسك"ی لێکرد، کابرای حەکیم بەرسڤی دایەوە:

– ئەم (مرواریيە کەسکە)ی کە تۆ بە دوایدا دەگەڕێی، جگە لە کوڕی پاشای یەمەن چ شتێکی دیکە نییە!

کابرای بازرگان کەگوێی لەم قسەیە بوو زۆری پیٚ سەیر بوو، و ناچار بەرەو کۆشکی پاشای یەمەن بە رێکەوتو کە گەییە ئەویٚ چووە لای شازادەو حاڵو حیکایەتەکەو داواکەی کیژە چکۆڵەکەی بۆ گێڕایەوە. کاتیٚ (مرواری کەسك) گوێی لەو حیکایەتە بوو، و گوتی:

– بەڵام من ناتوانم بە خۆم بێم بۆ لای کیژەکەت، بۆیە من ئەم سیٚ پاکەتەت دەدەمیٚو کاتیٚ گەییشتیتەوە لە جیاتی من بیاندە بە کیژەکەت!

ئیدی کابرای بازرگان، ئەو سیٚ پاکەتەی وەرگرتو دووبارە بەرەو کەشتییەکە بەڕێکەوتو کاتیٚ سواری پیرە کەشتی بوو، لە پڕ رێگەی دەریا کرایەوەو کەشتییەکە کەوتە

ڕێ. ئەنجام بە ساغو سەلامەتی گەیيشتەوە شارەكەی خۆیان. بەمجۆرە كاتێ كابرای بازرگان گەییە ماڵەوە، پاش ئەوەی كە گوارە ئەڵماسەكانی دا بە كیژە گەورەكەیو تەوقە ئەڵماسەكەی دا بە كیژە ناوەنجییەكەی، ئیدی ئەو سێ پاكەتەی گیرفانی دەرهێناو گوتی:

– ئەم سێ پاكەتە بگرەو لێرە بڕۆ، چونكە من لە پێناوی ئەم دیارییە سەیرو سەمەرەیەی كە تۆ داوات كردبوو، دووچاری بەدبەختیو زەحمەتێكی زۆر بووم.

بەمجۆرە كیژێ پاكەتەكانی لە بابی وەرگرتو لە ماڵ وەدەركەوتو هەر ڕۆیی ڕۆیی تا گەییە دەشتێكی بەربڵاو. لەم دەمەدا لە دڵی خۆیدا گوتی: "ڕەنگە ئەم پاكەتە شتێكی تیا بێو من لەبەر ئەمە لە ماڵ وەدەرنرابم". پاش ئەمە پاكەتی یەكەمی كردەوە...

لێ هەر كە پاكەتەكەی كردەوە، لە پڕ كۆشكێكی بەشكۆ لە بەردەمیدا قوت بووەوە. كیژێ واقی وڕمابوو، ئەوجا پاكەتی دووەمی دەرهێناو ئەویشی كردەوە... لە پڕ سەدان خزمەتكارو خوڵام لەبەردەمیدا دەركەوتنو كەوتنە ڕێكخستنو ئامادەكردنی كۆشكەكە. كیژێ كە خەریك بوو لە خۆشیاندا باڵ بگرێ، یەكسەر چووە ناو ئەم كۆشكە بەشكۆیەوەو ژیانی خۆی دەست پێكرد. ماوەیەك بوری، ڕۆژێك كە هێشتا پاكەتی سێیەمی نەكردبووەوە، كەوتە بیری ئەم پاكەتەو دەیویست بزانێ چی تیایە. لێ كاتێ پاكەتەكەی كردەوە، لە پڕ لە بەرانبەر دەروازەی كۆشكەكەوە پردێكی بلورین بە دیاركەوتو شازادەیەكی گەنج، كە هەمان (مرواری كەسك) بوو، بە سواری ئەسپێكی بەشكۆ بەسەر پردەكەدا بەرەو كۆشكەكە دەهات... لەم كاتەدا هەموو خزمەتكارو خوڵامەكان بەرەو دەروازەی كۆشكەكە غاریانداو كردیانەوەو كڕنۆشیان بۆ شازادەی لاو برد. ئەوجا شازادەی لاو بەرەو لای كیژێ كە لە سەرسامیدا حەپەسا بوو، ڕۆییو گوتی:

– من لە ئێستا بە دواوە هەر كاتێ سەری پاكەتەكە بكەیەوە دێمە لات. بەڵام دەبێ هەمیشە یەك شتت لە یاد بێ، ئەویش ئەوەیە كە هەر كاتێ كە من لەسەر پردەكە بووم، ئەگەر تۆ سەری پاكەتەكە بنەیتەوە ئەوا من یەكسەر دەمرم!

كیژێ كە بە دڵێ نا بە سەد دڵ ئاشقی ئەم شازادە قۆزە بوو بوو، بەخۆشحاڵییەوە گوتی:

– نا، من قەولت دەدەمێ كە هەرگیز سەری پاكەتەكە نەنرێتەوە.

با ئێستا بێینەوە لای خوشكەكانی كیژێ. كاتێ خۆشكی سێیەمیان لە ماڵ وەدەرنرا،و ماوەیەكی بەسەردا تێپەڕی ئیدی زۆریان بیر دەكرد، بۆیە بە مەبەستی دۆزینەوەی كەوتنە ڕێ. كە شەویان بەسەردا هات، بە ڕێكەوت ئەم جووتە خوشكە گەیی بوونە بەرانبەر كۆشكی خوشكەكەیانو كەتنە تەگبیری ئەوەی كە داوا لە خاوەنی ئەم كۆشكە بكەن كە بۆ ئەمشەو جێیان بكاتەوە. لە زەنگی دەروازەی قەسرەكەیاندا، خزمەتچیو خوڵامان دەروازەكەیان كردەوە، كیژێ كە دەنگی خوشكەكانی خۆی ناسیبووەوە، یەكسەرو بە خۆشحاڵییەوە رایكردە خوارەوەو ئەوانی لەگەڵ خۆیدا بردە سەرەوە بۆ ژوورەكەی خۆی. هەردووكیان سەریان لەوە سوڕمابوو كە خوشكەكەیان لەم كۆشكە بەشكۆیەدا چ دەكات! ماوەیەك شادو خۆشحاڵ بەوەی كە یەكتریان دۆزی بووەوە، كەوتنە قسەو باسان، ئەوجا گوتیان:

– دەتوانی دەستوور بدەی کە گەرماومان بۆ ئامادە بکەن؟ چونکە ئێمە ڕێگەیەکی زۆرمان بۆ دۆزینەوەی تۆ بڕیوەو بەیانی کە لە خەو هەستاین بۆ ماڵ دەگەڕێینەوە.

کیژێ یەکسەر کارەکەرو خولامانی راسپارد کە گەرماو بۆ خوشکەکانی گەرم بکەن‌و پاشان دەستووری بە کەنیزەکێکیش دا کە لە کاروباری گەرماوکردندا کۆمەکیان بکات. بەلام کاتێ کە جووتە خۆشك چوون بۆ گەرماو، لەو دەمەدا کە کەنیزەکەکە سەرگەرمی شۆردنی یەکێکیان بوو، ئەویتریان بە ئەسپایی بەناو ژوورەکانی کۆشك کەوت‌و کەوتە گەڕان، بەلام هەرچییەکی کرد نەیتوانی سەر لە نهێنی دەوڵەمەندی خوشکەکەیان دەربکا. بەلام سەرەنجام لە دوا ژووردا چاوی بە سێ پاکەت کەوت کە دووانیان کرابوونەوەو سێیەمیان داخرابوو. لەم دەمەدا کچە بەسەرسامی پاکەتی سێیەمی هەڵگرت کە داخرابوو، و سەرەکەی کردەوە، بەلام چونکە هیچی تێدا نەبینی، دووبارە پاکەتەکەی داخستەوەو لە شوێنەکەی خۆی داینایەوە.

بۆ سبەینێ ئەو جووتە خوشکە خوا حافیزیان لە خوشکە بچووکەکەیان کردو بەرەو ماڵی خۆیان گەڕانەوە. دوای چەند ڕۆژێك لەم واریقاتە، کیژێ کە چەندین ڕۆژ بوو شازادەی نەبینی بوو و بیری دەکرد، بە خۆشحاڵییەوە چوو بۆ ئەو ژوورەی کە پاکەتەکانی لێ بوو، و پاکەتی سێیەمی هەڵگرت‌و کردییەوە بەلام سەیر ئەوە بوو هەرچی چاوەنۆڕی کرد چ هەواڵێك لە پردی بلورین و شازادەوە نەبوو... ئیدی کیژێ خەمبارو خەمین‌و چاو بە گریان بە پەلە لە کۆشك وەدەرکەوت‌و بە پەرێشانی رووی کردە شوێنێکی نادیارو بە ئومێد بوو کە هەواڵێکی شازادەی ئەزیزی دەست بکەوێ. بەلام کاتێ گەییە ژێر دارێك، لە پڕ گوێی لێبوو کە دوو باڵندە لەسەر دارەکەوە بە یەکتریان دەگوت:

– دەزانی، تەنیا رۆنی مووی ئەم دێوەی کە لە ناو ئەم درەختەدا دەژی، دەتوانێ شفای شازادە (مرواری کەسك) کە زۆر نەخۆشە، بدات!

کیژێ زمانی مەلانی دەزانی، بۆیە کە گوێی لەو گفتوگۆیە بوو، دێوی ناو درەختەکەی کوشت‌و رۆنی مووەکانی گرت. ئەوجا بەلەز بۆ کۆشکەکە گەڕایەوەو پاش ئەوەی جل‌و بەرگی حەکیم باشی لەبەر کرد، ڕێگەی ئەو شارەی گرتە بەر کە "مرواری کەسك"ی لێدەژیا. کە گەییە ئەوێندەر، کەوتە سوڕانەوە بە شەقامەکانی شاراو هاواری دەکردو دەیگوت:

– من حەکیمێکی شفابەخشم، من حەکمێکی شفابەخشم!

ئەمەی بۆیە دەکرد تا دەنگی بگاتە گوێی شازادەو بتوانێ شەفای بدات. ئیدی دەنگی دەگاتە گوێی دایکی شازادەو دەستووریدا کە ئەو حەکیم باشییەی بۆ بەرن. سەربازانی شا چوون‌و هێنایان بۆ لای دایکی شازادە. دایکی شازادە بردی بۆ ئەو وەتاغەی کە شازادەی لێکەوتبوو، ئیدی کابرای حەکیم، کە هەمان کیژێ بوو، دەستووریدا کە دەبێ هەمووان لە ژوورەکە وەدەربکەون. ئەوجا بە دەنی شازادەی بەو ڕۆنەی کە لە مووی دێوەکەی گرتبوو، چەور کردو شێلاو چاوەڕوانی چاکبوونەوەی شازادەی کرد، ئیدی بەڕێکەوت ڕۆنەکە کاری خۆی کردو شازادە بەرە بەرە چاك بووەوەو عەلەمی تیا نەما. ئەم هەواڵە گەییە گوێی پاشا کە زۆر بۆ کوڕەکەی پەرێشان بوو، ئیدی ناردی بە شوێن کیژێداو پێی گوت:

– ئەی جەنابی حەکیم باشی هەر ئارەزوویەکت هەیە بیڵێ تا بۆتی ئەنجام بدەم. چونکە هیچ کەسێك تا ئێستا نەیتوانی بوو کوڕەکەی من دەرمان بکات.

کیژێ وەڵامی دایەوە:

– من تەنیا یەك ئەڵقەی نیشانەو گەردانەیەکم دەوێ!

پاشا کە ئەم داوا کەمەی کابرای حەکیم باشی پێ سەیر بوو، هەر چۆنێ بوو دەستووریدا کە ئەو دوو شتەی بۆ دابین بکەن، ئەوسا کیژێ دووبارە بەرەو کۆشکەکەی خۆی بەڕێکەوتەوەو هەر کە گەییشتەوە چوو بە سۆراخی پاکەتەکەوەو سەرەکەی کردەوە. لەپڕ بینی کە شازادە (مرواری کەسك) بە سواری ئەسپەکەی بەرەو کۆشکەکەی ئەو دێ. لەم کاتەدا ئەو ئەڵقەیەی کە پاشا، واتە بابی مرواری کەسك بەوی دابوو، کردە دەستو گەردانەکەشی لە مل کرد. کە شازادە گەییە لای کیژێ لێی پرسی کە چۆن توانیویەتی ئەو بدۆزێتەوە. کیژێ حاڵو حیکایەتەکەی لە سیری تاپیازی بۆ گێڕایەوە. دوای ئەوە ئاهەنگ و زەماوەندێکی چل شەوو چل ڕۆژە بەرپا کراو شازادە (مرواری کەسك) کیژێی خواستو بوون بە هاوسەرو ساڵانی ساڵ بەخۆشیو شادی پێکەوە ژیان.

## سەربوری دار هەناری چاو بە گریان

## و

## دار بەهێی دەم بە پێکەنین

پاشایەك هەبوو کە کوڕی نەدەبوو. ڕۆژێك کە هەستیکرد لە دوا ساڵەکانی تەمەن نزیك دەبێتەوە، بڕیاریدا کە ژنێکی دیکە بێنێ تا بەڵکو کوڕێکی ببێو لە دوای ئەو تەختو تاجەکەی وەربگرێ. ئیدی ژنێکی دیکەی هێناو پاش ماوەیەك کە ژنەکەی مژدەی دایێ کە سکی هەیەو بەو زووانە منالّی دەبێ، پاشا پێی گوت:

– ئەگەر منداڵەکەت کوڕ بێ ئەوا باشە، بەڵام ئەگەر کچ بێ ئەوا دەستوور دەدەم کە جەلادان یەکسەر لەسەرت بدەن!

بەڵام ژنەی داماو کە ئەمەی ژنەوت، هەڵبەتە ئەو نەیدەزانی کە کوڕی دەبێ یان کچ، لەو ڕۆژە بەداوەو شەوو ڕۆژی بە خەیاڵو ترسو فرمێسکانەوە دەبردە سەر. تا نۆ مانگو نۆ ڕۆژو نۆ سەعات تەواو بوو، ژنە منالّی بوو... منالّ کچ بوو. کچێکی بەڕاستی جوان. لێ کاتێ شابانۆی داماو قسەکەی پاشای وەبیر کەوتەوە، دەستی بە گریانو زاری کرد، لەم کاتەدا وەختێ هاودەمەکەی، کە ژنێکی زۆر دڵسۆز بوو، بینی شابانۆ زۆر سەرگەرمی گریانە، بەسەرسامی پرسی:

– خانمەکەم، بۆچی دەگریت؟

شابانۆ دەستی هاودەمەکەی لە نێو دەستی خۆی خستو بە پاڕانەوەو خەمبارییەوە گوتی:

– چۆن نەگریم، ئەگەر پاشا بزانێ کە کچم بووە، یەکسەر دەستوور دەدا کە سەرم ببڕن.

کاتێ هاودەمی زیرەك بەمەی زانی، یەکسەر دەستێك جلی کوڕانەی هێناو کردیە بەری کچەکەو ئەوجا پەیامی بۆ پاشا نارد کە: – قیبلەی عالەم سەرت سەلامەت بێ، هاوسەرەکەت کوڕی بووە.

وەختێ پاشا ئەم هەواڵەی ژنەفت، زۆر خۆشحالّ بوو و پاداشتێکی گرانبەهای بە هاودەمی خێزانەکەی، کە ئەو مژدانەیەی بۆ هێنابوو، بەخشی.

مانگانو ساڵان بورینو ئەم نهێنییە سەیرە وەکو خۆی مایەوە. ئیدی شازادەخانم کە هەمیشە جلی کوڕانەی لەبەر بوو و هەمووان بە کوڕیان دەزانی جگە لە دایکیو کارەکەرەکەی دایکی، ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەترو جوانتر دەبوو. بەڵام تا ئەو زیاتر گەورە دەبوو, شابانۆی داماو خەمبارتر دەبوو تا ئەنجام شازادەخانم گەییە شازدە ساڵی.

بابی، واتە پاشا کە هەستی دەکرد هەتاوی تەمەنی ڕوو لە ئاوا بوونە، پەیامی بۆ شابانۆ ناردو گوتی کە دەیەوێ بەر لەوەی بمرێ، زەماوەندی کوڕەکەی بە چاوی خۆی ببینێ!

شابانۆ بەم هەواڵە خەریك بوو دڵی بوەستێ. ئاخر چۆن دەبێ کە..... بە کورتی شابانۆ شەوو رۆژی بە گریان دەبردە سەر، تا رۆژێك شازادەخانم هەستی بە خەمباری دایکی کردبوو و چوو بووە لایو پرسی بووی:

– دایکی ئازیزم، چ شتێك ئەوەندە پەرێشانو خەمباری کردووی؟ شابانۆ کە هەستیدەکرد لەوەی پتر بە تەنیا باری ئەم خەمە نابات، لێرا ئەم رازەی کە شازدە ساڵ بوو لە دڵی خۆیدا هەڵیگرتبوو ئاشکرا بکاتو گوتی:

– کچە ئازیزەکەم، تۆ دەزانی کە باوکت پێی وایە تۆ کوڕیتو ئێمەش بۆیە جلی کوڕانەت لەبەر دەکەین، چونکە بەر لەوەی تۆ بێیتە دنیاوە باوکت هەڕەشەی کردبوو کە ئەگەر منداڵەکە کچ بێ ئەوا دەستوور دەدات کە لە ملی من بدەن, بۆیە کارەکەرەکەم هەر کە تۆ هاتیتە دنیاوە جلی کوڕانەی لەبەر کردیتو هەواڵی بۆ بابت نارد کە ژنەکەت, واتە من، کوڕم بووە! جا ئێستا کە تۆ تەمەنت بووە بە شازدە ساڵان، باوکت زۆر حەز دەکات کە ژنت بۆ بێنێ، جا ئەگەر ئێستا بزانێ کە تۆ لە راستیدا کچی نەك کوڕ، ئەوا یەکسەر دەستوور دەدا کە بمانکوژن! کاتێ شازادەخانم گوێی لەم قسەیە بوو بەوپەڕی میهرەبانی دەستی لە ملی دایکی کردو گوتی:

– دایکەگیان ئەوەندە خۆت نیگەران مەکە, گرنیگ نییە, من هەمیشە دەمزانی کە ئەم رۆژە هەردێ. ئێستاش دەزانم کە بابم کیژێکی بۆ من داوەتە چاو. بەڵام من نەخشەیەکم داناوە, ئەویش ئەوەیە کە سبەینێ, کە رۆژی ئاهەنگی نیشانەکردنە بۆ من, بە باوکم بڵێم کە دەمەوێ ئەسپەکەم ببەمە حەوشەو ئاوی بدەم. هەر کە چوومە حەوشی کۆشك, بەئیسارەتێك بە ئەسپە خۆشبەزەکەم, دەمگەیەنێتە سەر بەرزترین کێوان و بەمجۆرە دەتوانم ماوەیەك لێرە دووربم و رۆژێك لە رۆژان بە خواستی خوا بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە. پاشان شازدەخانم بە چاوانی پڕ فرمێسکەوە, خوا حافیزی لە دایکی کردو چوو بۆ ژوورەکەی خۆیو چاوەڕوانی هاتنی سبەینێ بوو... سبەینێ لە کۆشکدا بوو بە هەراو ئاهەنگو بەزمێ ئەوسەری دیار نەبوو. ئاشچیو خولامان زۆر سەرقاڵ بوونو خەریکی تەدارەکی ئاهەنگی نیشانەی شازادە بوونو باشترین نەوا ژەنانی شار بۆ کۆشك دەعوەت کرابوون، و لەم دەمەدا پاشا هاتە لای شازادەخانمو بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

– کوڕە ئازیزەکەم، ئەمڕۆ خۆشترین رۆژی ژیانی منە، چونکە دەمەوێ تۆ لە جلی زاوایەتیدا بدینمو هەموو ئارەزوو و ئاواتێکم ئەمەیە کە تۆ شادو بەختەوەر بیو لە دوای من ئەم تەختو تاجە بە تۆ بپڕێ!؟

شازادەخانم کە هەستیکرد کاتی جێبەجێ کردنی نەخشەکەی لە بارە، یەکسەر بەبابی گوت:

– باوکە گیان، رێ دەدەی کە من ئەسپەکەم بۆ ئاودان بەرمو پاشان کەمێك بە دەوروبەری کۆشکەکەدا پیاسە بکەمو ئەوجا بێمەوە خزمەتت!

ئەوجا بە پەلە هەوساری ئەسپەکەی گرت‌و لەوێ هاتە دەرەوە لێ وەختێ ئەسپەکەی بینی کە شازادە خانمی نەشمیل دەگری، بە ئەسپایی پێی گوت:

– ئۆو شازادەی ئازیز، ئەوەندە خۆت ناڕەحەت مەکە، ئەگەر حەز ناکەی لێرە بی، کوێت پێ خۆشە، من وەکو با دەتڕفێنم‌و بۆ ئەوێندەرت دەبەم!

شازادە خانم دەستەکانی لە گەردنی ئەسپە بە ئەمەکەکەی وەرێناو سوپاسی کردو ئەوجا سواری بوو و داوای لێکرد کە بیگەیەنێتە بەرزترین کێوان، ئەسپەکە دوای ئەوەی تاوێك بە کەناری حەوزی کۆشکەکەدا رایکرد، ئەوجا لە پڕ پازێکی هەڵداو لە چاو تروکانێکدا بەسەر دیـواری کۆشـکەکەدا دەرپـەڕی و وەکـو بـا کەوتـە تـاودان! وەخـتێ غوڵامـانی شـا، شازادەخانمیان بینی کە بە سواری ئەسپەکەی لە دیواری کۆشکەکەوە پازی داو بە چوار ناڵە لەوێ دوور کەوتەوە، کەوتنە تاقیبیان، بەڵام زۆریان پێ سەیر بوو کە هیچ ئاسەوارێکیان لە ئەسپەکەو شازادەخانم نەبینی، دەتگوت دوو دڵۆپە ئاون‌و زەوی قووتی دان، هیچ جێ پێیەکیان لە پاش بەجێ نەمابوو!

بە کورتی شازادەخانم‌و ئەسپە خۆشبەزەکەی هەر رۆییشتن‌و رۆییشتن، هەورازو نشێویان بڕی‌و پاش ماوەیەکی زۆر گەیینە دەشتێکی پان‌و بەرین، ئەسپەکە بە شازادەخانمی گوت:

– شازادەخانمی ئازیز، من ئەوەندەی لە توانامدا بوو غارم داو تۆم گەیاندە ئێرە لە دوورەوە تروسکاییەك دیارە، لێرە بەدواوە دەبێ بە خۆت بڕۆی، من ناتوانم لەوە زیاتر لەگەڵ تۆدا بم، دەبێ لە ئێستا بە دواوە لێکدی جودا ببینەوە. بەڵام من سێ داوە مووی خۆمت دەدەمێ کە هەر کاتێ گیرۆدە بووی، پێکیانەوە گرێ بدە، من یەکسەر فریات دەکەوم‌و دێمە یارمەتیت. بەڵام دەبێ بەر لە هەر شتێك داوا لە خوا بکەی کە بتپارێزێ.

شازادە خانم ناچار لە ئەسپە وەفادارەکەی جیا بووەوەو بەرەو تروسکاییەکە کە لە دوورەوە دیار بوو کەوتە رێ. لێ کاتێ گەییە تروسکاییەکە، سەیری کرد ئەمە کۆشکێکی یەجگار جوانە. بە دوو دڵی چەند جارێك لە دەرکەیداو چاوەنۆڕی کرد. پاش ماوەیەك، پیاوێك دەرکەی کردەوەو کەچاوی بە کوڕێکی ناسك‌و بچووك کەوت، پرسی:

– رۆڵە گیان، چیت دەوێ‌و لێرە چ دەکەی؟

شازادە خانم کە زۆر خەمبارو دڵتەنگ بوو، وەڵامی دایەوە!

– تکا دەکەم بەزەییت پێم دا بێتەوەو رێم بدە کە وەکو خزمەتکار لێرە کار بکەم!

پیاوەکە کە خزمەتکاری ئەم کۆشکە بوو, دڵی بە حاڵی شازادەخانم سووتاو قاییل بوو بەوەی وەکو شاگرد ئاشپەز لەم ماڵەدا کار بکات‌و دەستی گرت‌و بۆ ئاشخانەی کۆشکەکەی برد، لێ وەختێ شازادەخانم دەستی بە کار کرد، هێندە بە لیاقەت‌و کارزان‌و دەستاو خۆش بوو، کە خزمەتکارەکە رێی دایێ کە لەوە بە دواوە شازادە خانم بە خۆی هەموو خواردنەکان لێ بنێ‌و ئامادەیان بکات.

ئەم کۆشکە هی شازادەیەك بوو کە دەمێ بوو هاوسەرەکەی مردبوو و ئێستا بە تەنیاو لەگەڵ چەند خولام و خزمەتکارێکدا لەم کۆشکەدا دەژیا. شازادە هەر جارێ کە خواردنیان بۆ دەهێنا، دەیگوت: بەهبەه ئەم خواردنانە چەند بەلەزەت تر بوون...

بە هەر حاڵ رۆژێ لە خزمەتکارەکەی پرسی:

– ئەرێ ئەم خواردنانە هەر چێشچییەکەی جاران لێیان نانێ؟ بە هەر حاڵ ئەو کەسەم بۆ بنێرە کە ئەم خواردنانە لێدەنێ.

شازادەخانم کە هەمیشە لە گۆشەیەکی چێشتخانەکەدا نانی دەخواردو دەخەوت، کە بەمەی زانی، خێرا جلە کوڕانەکەی لەبەر کردو چوو بۆ لای شازادە. شازادە وەختێ ئەوی بینی پرسی:

– کوڕم، تۆ خەڵکی کوێیت و بابت کێیە؟

شازادەخانم وەڵامی دایەوە:

– من کوڕی بازرگانێکی زۆر دەوڵەمەندم، لێ کاتێ لەگەڵ بابمدا لە سەفەر بووین، من رێم گوم کردو پاش ماوەیەك سەرگەردانی گەییمە ئەم کۆشکە!

شازادە گوتی:

– زۆر چاکە کوڕم، من هەر کە بینیتم زانیم کە تۆ کەسێکی نەجیبزادەی و کوڕێکی بێ سەروبەر نیت، من خاوەنی سێ کیژم کە تەنیا سێیەمیان هەندێ خۆسەرو کەللە رەقە، بەڵام بە هەر حاڵ هەر سێکیان لە ئەمروڕای مندان و من هەر چییەك بڵێم، لە قسەم دەرناچن. بۆیە مۆڵەتت دەدەم کە سبەینێ هەرسێکیان ببینی و کامیانت چووە دڵەوە دەتدەمێ!

سبەینێ شازادەخانم بە دەستووری شازادە، بە جلە کوڕانییەکانییەوە، چووە دیدەنی هەر سێ کیژەکەو پاش ماوەیەك هاتەوە بۆ لای شازادەو گوتی کە کیژی سێیەمی پەسند کردووەو حەز دەکات لەگەڵ ئەودا زەماوەند بکات.

لێ شازادە کە ئەو قسەیەی ژنەوت چارەی گرژ بوو و گوتی:

– کوڕم ئەوەیان کیژێکی زۆر سەرسەختە، بڕۆ بیر بکەوەو پاشان جوابم لێ بگێڕەوە!

لێ کوڕێژگەی ئاشپەز، واتە شازادەخانم دەست بەردار نەبوو، و پاشا کە بینی شازادەخانم سوورە لەسەر رای خۆی، کیژەکەی گاز کردو پێی گوت کە ئەم کوڕە لاوە پەسندی کردووەو دەبێ شووی پێ بکات. لێ کچۆڵەکە بە بابی گوت:

– بابەگیان، رێم بدە با ئەمشەو بیر لەم لاوە بکەمەوەو سبەینێ جوابتان لێدەگێڕمەوە!

وەختێ بوو بە شەوو هەمووان خەوتن، شازادەخانم کە دەیزانی هەمیشە ئەم کیژە لە ژوورێکدا زیندانی دەکەن، بۆ ئەوەی سەر لە مەتەڵی ئەم کارە دەربێنێ، بە ئەسپایی چووە پشت دەرکەی ئەو ژوورەی کە کیژەکەیان تێدا حەپس کردبوو، لە کونی کلیلەکەوە تەمەشای

ناو ژوورەکەی کرد... لەم دەمەدا بینی کە کیژەکە مەسینەیەکی زێڕین و گۆزەیەك ئاوی هەڵگرت و لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەی دانا,و ڕێك لەم کاتەدا کۆترێکی سپی بە دەم فڕینەوە هات و لە قەراخ پەنجەرەی ژووری کیژەکە نیشتەوە... کیژە دڵۆپە ئاوێکی تکاندە دەمی کۆترەکەوەو.... لە پڕ ئەم کۆترە سپیە بوو بە لاوێکی قۆزو جوان و ئەوجا کیژێی لە هەمێز گرت و کەوتنە ماچ کردنی یەکدی. لەم دەمەدا کیژێ بە کوڕە لاوەکەی گوت: – خۆشەویستەکەم، ئەمڕۆ کوڕێکی لاسار هاتۆتە خوازبێنیم، ئێستا من تەگبیرم چییەو دەبێ چ بکەم؟

لاوەکە بە دەم پێکەنینەوە گوتی:

– خۆشەویستم، ئەمە گرینگ نییە، دەتوانی پێی بڵێی کاتێ شووی پێدەکەی ئەگەر بڕوات و جوانترین ئاوێنەی دنیات بۆ بێنێ کە ئەم ئاوێنەیە لە باخێکدایە کە باخەکە هی دێوێکە، جا کە کوڕەکە بچێتە ئەم باخەوە، دێوەکە یەکسەر دەیخوات و ئێمە لە شەڕی رزگار دەبین!

بۆ بەیانی کیژێ چووەوە بۆ لای بابی و گوتی:

– باوکە گیان، من تەنیا بەیەك مەرج شوو بەم کوڕە دەکەم. مەرجەکەش ئەمەیە کە جوانترین ئاوێنەی دنیام بۆ بێنێ!

وەختێ پاشا گوێی لەم مەرجە سەیرە بوو، روویکردە کوڕە ئاشچییەکە، واتە شازادەخانم, و گوتی:

– دەبینی کوڕم، ئەم کیژە سەرسەختەی من حەزی لە چ شتگەلێکە!

لێ شازادە خانم بزەیەکی بۆ کردو گوتی:

– قەیدی نییە، من خێرا دەڕۆم و ئەو ئاوێنەیە دێنم کە کیژەکەت دەیەوێ.

کە شازادەخانم بۆ ئاشخانەکە گەڕایەوە، ئەو سێ داوە مووەی کە ئەسپە وەفادارەکەی دابوویێ، لەبەرکی دەرهێناو پێکەوەی گرێ دان و لە پڕ ئەسپە خۆشبەزەکەی ئامادەبوو، کاتێ شازادە وەزع و حاڵی خۆی بۆ گێڕایەوەو تێی گەیاند کە چ کۆمەك و یارمەتییەکی پێویستە, ئەسپەکە وەڵامی دایەوە:

– خانمەکەم ئەمە کارێکی گەلەك قورسە، بەڵام قەیدی نییە خوا یارمەتیمان دەدات!

ئەوجا شازادەخانمی هەڵدایە سەر پشتی خۆی و بەلەز بەرەو باخی دێوەکە کەوتنە رێ، ئەسپەکە بەدەم رێوە گوتی:

– شازادەخانم تۆ دەبێ چاك گوێ لەم شتانە بگری کە پێت دەڵێم:

وەختێ دەگەینە دەرکەی باخەکە، شێرێك و بەرخێك دەبینی کە هەندێ گیا لە بەردەم شێرەکە دانراوەو تۆ دەبێ هەڵیگری و بیخەیتە بەر بەرخەکەو هەندێ گۆشتیش لەبەر بەرخەکە دانراوە کە دەبێ هەڵیگری و بیخەیتە بەر شێرەکە، ئەگەر ئەمە بکەی هیچ ئازارێکت پێ ناگەیەنن و رێگەت دەدەن کە بچیتە ناو باخەکەوە. کە چوویتە باخەکەوە, دێوەکە دێتە

بـەردەمت. بـەڵام تـۆ نـابێ بترسـیت و بێباکانـە بچیتە پێشـەوە. ئـەوجا دێوەکـە دەتباتـە ژوورێکەوەو پێت دەڵێت: "من دەچم شۆربایەکی بەلەزەتت بۆ لێدەنێم"! لـێ تـۆ دەبـێ تـێ بگـەی کـە مەبەسـتی ئەوەیـە کـە دەڕوات ددانـەکانی تیـژ دەکاتـەوە بـۆ ئـەوەی بگەڕێتـەوەو تـۆ بخوات. بۆیە دەبێ زۆر بە پەلە ئاوێنەکە لـە سەندوقچەکەی دەربێنی و بە زووترین کات لە باخەکە وەدەر بکەوی!

پاش ئەوەی ئەسپەکە لە قسەکانی بووەوەو گەییشتنە بەر دەرگای باخەکە، شازادەخانم بـە گـوێرەی قسـەکانی ئەسـپەکەی رەفتـاری کـرد... ئـەنجام وەخـتێ ئاوێنەکـەی دۆزییـەوە هەڵیگرت و بەرەو دەرگای باخەکە غاریدا. لێ کە دێوەکە کە زانی ئەو ئاوێنەکەی هەڵگرتووەو لە حاڵی غاردان دایە، کەوتە تاقیبی. لێ شازادەخانم بەپەلە لـەو رووبـارەی ناوەنـدی باخەکە پەڕییەوەو کاتێ دێوەکە لەوبەری رووبارەکە مایەوەو بینی دەستی بە شازادەخانم ناگات، بە تورەیی هاواری کردو بە بەرخەکەی گوت:

– بیگرە، بیگرە!

لێ بەرخەکە وەڵامی دایەوە:

– چۆن دەیگرم، ئەو گیایەکەی نایە بەر من!

ئەوجا دێوەکە بە شێرەکەی گوت کە بیگرێت، لێ شێرەکەش وەڵامی دایەوە:

– نـەخێر مـن نـایگرم، چـونکە ئـەو گۆشـتەکەی نایـە بـەر مـن و مـنی لـە برسـێتی خەلەساند.

ئەوجا دێوەکە کە بەڕاستی تورە بوو بوو، بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆی لە کیژێ بکاتەوە، کەوتە تووک و نەفرین و گوتی:

– ئەگەر کوڕی خوایە ببی بە کچ و ئەگەر کچی خوایە ببی بە کوڕ!

وەختێ دێوەکە ئەو قسەیەی کرد لە پڕ شازادەخانم بە راستی بوو بە کوڕ, لە کاتێکدا کـە زۆر بەم رووداوە خۆشحاڵ بوو بوو, سواری ئەسپەکەی بوو و بە پەلە بەرەو کۆشـکی شـازادە کەوتە رێ و کاتێ گەییە ئەوێندەر،چووە لای کیژێ و ئاوێنەکەی پێشکەش کرد.

بەمجۆرە مەرجەکەی کیژێی ئەنجامـدا, ئـەو شـەوە کـاتێ کیـژێ دڵـدارە نهێنییەکـەی خـۆی بینی، هەواڵی دایێ کە نەخشەکەیان سەری نـەگرتووەو کوڕەکـە ئاوێنەکـەی هێنـاوەو، پرسـی کە ئێستا دەبێ چ کارێك بکات؟ ئەو وەڵامی دایەوە:

– دەبێ ئەمجارە بۆ باخەکەی منی بنێری، و داوای لێ بکەی کە "درەختی هـەناری چاو بە گریان"و درەختی بەهێی دەم بە پێکەنین"ت بۆ بێنێ!

بۆ سبەینێ کیژێ چووە لای بابی و خواستی خۆی پێ گوت، لـێ ئـەمجارەش شـازادەخانم کە ئێستا بە راستی بوو بوو بە کوڕ، دووبارە مووی ئەسپەکەی گرێ دایـەوەو پـاش ئـەوەی ئەسپەکە دەرکەوت، سواری بوو و بە پەلە بەرەو ئەو باخە کەوتە رێ، لێ شازادە بـەدەم رێـوە کوڕێژگەیـەکی لاوازی بـینی کـە کڵاوێکـی پێسـتی بـە دەسـتەوە گرتبـوو و زۆر بـە پـارێزەوە هەڵیدەگرت. شازادە کە ئەمەی زۆر بە لاوە سەیر بوو, ئەسپەکەی راگرت و لە کوڕەی پرسی:

– ئەمە چییە بە دەستەوە بۆ کوێی دەبەی؟

کوڕیژگەکە وەڵامی دایەوە:

– ئەمە کڵاوێکی ئەفسوناوییەو هەر کەسێك لەسەری بکات، لە چاو ون دەبیٚ‌و ئیدی کەس نایبینیٚ!

شازادە کە زانی ئەم کڵاوە چەند بە کەڵکی ئەو دیٚ، یەکسەر چەند سکەیەکی زێڕی لە بەرکی دەرهێناو دای بە کوڕیژگەکەو کڵاوەکەی لیٚ کڕیو دووبارە کەوتەوە ریٚ. بە هەرحاڵ گاڤیٚ کە گەییە بەر دەرکەی باخەکە، کڵاوەکەی لەسەرناو لە چاو بزر بوو و ئەوجا چووە باخەکەوە. لە کاتێکدا دەیڕوانییە ئەم لاو ئەولا زۆری نەبرد ئەو درەختانەی دۆزینەوەو دار هەنارەکەی بە دەستێك و دار بەهێیەکەی بە دەستێکی دیکەی هەڵگرت. لیٚ ریٚك لەم کاتەدا دار هەنارەکە بە دەنگی بەرز کەوتە گریان‌و دار بەهێیەکەش دەستی بە پێکەنین کرد، ئەمما پێکەنین!

کاتیٚ کیژیٚ‌و دەنکەکەی ئەم دەنگەیان گویٚ لیٚ بوو، زۆر سەرسام بوون‌و کوڕەکە گوتی:

–خۆشەویستەکەم، باش گویٚ بدە ئەو دەنگەی کە دەیژنەوی، ئەمە ئەوە دەسەلمێنیٚ کە ئەو لاوێکی زۆر بە هۆش‌و دلێرە،و ئەوەتا دووەمین مەرجی مەحاڵی تۆی ئەنجام داوە. تا ئەم سەعاتە تۆ هی من بووی، لیٚ لە ئێستا بە دواوە من بە حوسن‌و رەزای خۆم تۆ بەو دەبەخشم‌و حەز دەکەم شووی پیٚ بکەی!

بە کورتی شازادە کە توانی بووی بەڵێنی خۆی بەرێتە سەر "دار هەناری چاو بە گریان"و "دار بەهێی دەم بە پێکەنین"ی بۆ کیژیٚ هێنا، ئەویش دەستی دایە دەستی شازادەی دلێرو زەماوەندی لەگەڵدا کرد.

پاش ئەوەی حەوت شەوو حەوت رۆژ ئاهەنگی زەماوەندیان گێڕا، ئەوجا شازادە کیژێی لەگەڵ خۆدا بردو بەرەو شارەکەی خۆیان، بۆ لای دایکی گەڕایەوە... شابانۆی داماو هێندە لە دووری فەرزەندەکەی گریا بوو، کوێر بوو بوو, لیٚ کاتیٚ کە هەواڵی گەڕانەوەی ئەوی بیست، فرمێسکی خۆشحاڵی لە چاوان هات‌و ئیدی زانی کە ساڵانی جودایی کۆتایی هاتووە، پاشاش کە زۆر پیر بوو بوو کاتیٚ چاوی بە رۆڵەکەیان کەوت، کە بوو بوو بە کوڕێکی رەشید، ئەویش بە خۆشحاڵییەوە شازادەی لە هەمێز گرت‌و پاشان هەموویان، واتە پاشای پیرو شابانۆو شازادەو هاوسەرەکەی ساڵەهای ساڵ بە خۆشی‌و شادی لەگەڵ یەکدیدا ژیان.

## بزنی زێرین

پاشایەك هەبوو كە دەمێ ساڵ بوو ژنەكەی مردبوو، ئەم ژنە تەنیا یەك كیژی لە پاش بەجێ مابوو. ئەم كچە یەجگار جوانو دڵپەسەند بوو، هەر رۆژێ كە گەورەتر دەبوو، سەد ئەوەندە جوانتر دەبوو. قژە زێرینەكەی، و چاوە شینەكانی و گۆنا خڕپنو سوورەكانی كردبوویانە كارێك هەموو شازادەو لاوانی ئەو رۆژگارە عاشقی ئەو بنو بڕ بڕ خوازبێنی كەران روو بكەنە كۆشكەكەی باوكی.. ئەم كیژە مامۆستایەكی لە ماڵەوە هەبوو كە دەوری دایكیشی دەبینیو ژنێكی زۆر ناڕەسەنو بەدخواز بوو. هەر كەسێك دەهاتە خوازبێنی. پەسندی نەدەكردو بەناوی شازادەخانمەوە جوابی دەكردو بەكورتی بوو بووە مایەی ئەوەی كە شازادەخانمی جوانو نەشمیل هەر بە عازەبی و بە تەنیا بمێنێتەوە.

تا رۆژێك ئەم ژنە فێڵبازە هەر بەوەندەوە نەوەستاو لێبڕا كە كارێك بكات شازادەخانم تا كۆتایی تەمەنی هەر بەو دەقەوە بمێنێو شوو نەكات. پاش بیركردنەوەیەكی زۆر رۆژێك بیرۆكەیەكی شەیتانانەی بۆ هاتو چووە لای پاشاو گوتی:

– قیبلەی عالەم سەلامەت بێ، دەزانی شازادەخانم خوازبێنی كەرانێكی زۆرو هەمە جۆری هەیە، بۆیە تۆ هەرگیز ناتوانی یەكێك لە نێو ئەو هەمووەدا هەڵبژێری، لێ ئەمڕۆكە بەیانی بیرێك بە مێشكی ئەم كەنیزەكەتاندا هاتووە ئەگەر رێم بدەی عەرزی جەنابتانی بكەم... كلیلی ئەم مەتەڵەیە!.

پاشا كە بە تەبیعەت پیاوێكی دڵ باشو میهرەبان بوو، زۆری حەز دەكرد بزانێ كلیلی ئەم مەتەڵە چییە، بۆیە رێگەی دا كە قسە بكات. مامۆستای ناڕەسەن گوتی:

– دەبێ دەستوور بدەی كە كۆشكێكی ژێر زەمینی بۆ شازادەخانم دروست بكەنو لەمە بەدواوە لەوێندەر بژی. ئەم كۆشكە دەبێ بە هۆی پێ بیلكەیەكی ئاسنەوە بە دەركۆكەیەك بگات، كە ئەم دەركۆكەیە تاقە رێگەی پەیوەندی ئەم كۆشكە بێ بە دنیای دەرەوە! ئەم دەركەیەش دەبێ لە بنی حەوزە گەورەكەی كۆشكدا بێ تا بەمجۆرە كەس نەتوانێ پەی بە شوێنەكەی شازادەخانم ببات!

پاشان دەبێ شازادەخانم ببەینە ئەوێندەر تا لەوێ بژیو ئەوجا هەر كەسێك بێتە خوازبێنی، مەرجەكەمان ئەوە بێ كە لە زەرفی سێ رۆژا بتوانێ شازادەخانم بدۆزێتەوە، ئەگەر لە كۆتایی ئەم سێ رۆژە نەیتوانی بیدۆزێتەوە، دەبێ دەستوور بدرێ كە یەكسەر لە ملی بدەن!

پاشا وەختێ گوێی لەم قسەیەی مامۆستا بوو، ماوەیەك تێفكریو سەرەنجام نەخشەكەی مامۆستای پەسند كردو دەستووریدا كە تا چل رۆژی دی ئەم كۆشكە ئامادە بكرێ. مامۆستای حیلەباز زۆر دڵی بەوە خۆش بوو كە نەخشەكەی سەری گرت، بە خۆشحاڵییەوە

هاتە دەرێ‌و یەکسەر دەستووری دا کە باشترین ئەندازیاران‌و دارتاشانی شار لە کۆشك ئامادە بن‌و دەست بە دروستکردنی کۆشکە نهێنییەکەی شازادەخانم بکەن.

چل شەوو چل رۆژی تەواو کاریان کردو ئەنجام کۆشکەکەی شازادەخانم لە ژێر باخەکەدا ئامادەکرا. مامۆستا دەستووریدا کە شازادەخانم بۆ ئەوێندەر ببرێ‌و کچۆلەی داماو لەوێدا کە هیچ رێگەیەکی بۆ دنیای دەرەوە نەبوو جگە لە دەرکەیەکی بچووك، بژی. بەمجۆرە شازادەخانمی داماو بوو بە خەڵکی ئەم کۆشکە ژێرزەمینی‌و نهێنییە.

کاتێ ئەم باسە لە نێو خەڵکیدا بڵاو بووەوەو جاڕچییان لە شاردا جاڕیاندا، هەر رۆژەی دەستەیەك لاوی قۆزو دەوڵەمەند دەهاتنە خوازبێنی شازادەخانم، بەڵام چونکە کەسیان نەیاندەتوانی شازادەخانم بدۆزنەوە، لە کۆتایی رۆژی سێیەمدا جەلادانی پاشا لەسەریان

دەدان‌و بەمجۆرە ژمارەیەکی زۆر لە لاوان لە پێناوی شازادەخانمدا گیانیان لە دەست دەداو مامۆستای زاڵم کە زۆری کەیف بەم وەزعە دەهات، دەستووری دابوو کە بورجێك لەو سەرە بڕاوانە لە ناو کۆشکدا دروست بکەن کە رۆژ بە رۆژ بەرزتر دەبوو....

چەند ساڵێك بوری، بەڵام هێشتا کەس نەیتوانی بوو شازادەخانم بدۆزێتەوەو بەو دەقەوە لە کۆشکە ژێر زەمینییەکەدا دەژیا. مەملەکەتێکی دیکەی دراوسێی وڵاتی ئەم پاشایە هەبوو، پاشای ئەم مەملەکەتە سێ کوڕی گەنجی هەبوو، کە هەموو ئەفسانەی ژیانی ئەم شازادەخانمە نەشمیلەیان ژنەوتبوو و زۆریان حەز دەکرد بچنە خوازبێنی‌و کیژێ بدۆزنەوە. تا رۆژێك کوڕی گەورەی پاشا چووە کن بابی‌و گوتی:

– باوکە من گەرەکمە کە ئەم شازادەخانمە بدۆزمەوەو زەماوەندی لەگەڵدا بکەم!

لێ پاشا کە بە بڕیاری کوڕەکەی زانی زۆر خەمبار بوو و دەستی بە ئامۆژگاری کوڕەکەی کردو گوتی:

– کوڕەکەم، رەحم بە جەوانی خۆت بکە. تۆش وەکو لاوانی دی هەرگیز ناتوانی پەناگەی شازادەخانم بدۆزێتەوەو سەری خۆت لەم رێگەیەدا بە با دەدەی.

لێ شازادە گوێی بە قسەکانی بابی نەداو هەر مکوڕ بوو لەسەر بڕیاری خۆی. پاشا کە دەیبینی ناتوانێ قەناعەت بە کوڕەکەی بکات، دەستووریدا کە پێداویستیی سەفەری بۆ ئامادە بکەن، و بەمجۆرە شازادەی لاو خودا حافیزی لە باوك‌و براکانی کردو کەوتە رێ. پاش چەندین رۆژە رێ‌و بڕینی چەندین هەورازو نشێوان، ئەنجام گەییە ئەو شارەو گەییە کۆشکی پاشا, لەم کاتەدا سەربازانی پاشا گرتیان‌و بۆ لای پاشایان بردو شازادە بە پاشای گوت:

– من خۆم کوڕی پاشام‌و هاتووم‌و دەمەوێ شازادەخانم بدۆزمەوەو پاشان زەماوەندی لەگەڵ بکەم!

پاشا کە پیاوێکی میهرەبان بوو، دڵی بە حاڵی شازادە سووتاو گوتی:

– کوڕەکەم باش بیر بکەوە، تا ئێستا چ کەسێك لەم رێگەیەدا سەرنەکەوتووە. تۆ زۆر گەنجی‌و دەتوانی لەگەڵ زۆر کیژدا کە رەنگە لە جوانیدا هیچیان لە شازادەخانم

کەمتر نەبێ، زەماوەند بکەی. ئەمە جگە لەوەی کە ئەگەر نەتوانی لە زەرفی سێ ڕۆژدا شازادەخانم بدۆزییەوە، ئەوا لە سەرت دەدرێ.

بەڵام شازادەی لاو، وەڵامی دایەوە:

- لێ من ئامادەم ڕووبەڕووی چارەنووسی خۆم، هەرچییەك بێ، ببمەوەو، لێرە ناڕۆم تا شازادەخانم نەدۆزمەوە!

بەم پێیە پاشا لە کاتێکا کە زۆر داخی بۆ ئەو کوڕە لاوە دەخوارد، ناچار قاییل بوو قەرار درا لە سبەی بەیانییەوە شازادەی لاو دەست بە گەڕان و تاقیبی خۆی بکات. بەڵام کە سێ ڕۆژەکە تەواو بوو هێشتا شازادە، کە هەموو کون و کەلەبەری کۆشکەکە گەڕابوو، نەیتوانی بوو شازادەخانم بدۆزێتەوە، بۆیە بە گوێرەی ئەو قەول و قەرارەی کە کرابوو، لەسەری شازادەیان داو بەمجۆرە سەرێکی دیکە خرایە سەر بورجەکە!

لەولاشەوە وەختێ ماوەیەك بوری و چ هەواڵێك لە گەڕانەوەی شازادە نەبوو، برای دووەمی چووە لای پاشاو گوتی:

- باوکە، ئەمجارەیان من دەمەوێ بچمە تاقیبی شازادەخانمی نەشمیل و زەماوەندی لەگەڵ بکەم!

پاشا کە هێشتا خەمی لە دەستدانی کوڕە گەورەکەی لە دڵ دەرنەچوو بوو، وەڵامی دایەوە:

- بەڵام کوڕەکەم، براکەی تۆ لەم سەفەرە نەگەڕایەوەو دوور نییە کەگیانی لە دەست دابێ، کەواتە دەبێ تۆ ئاقڵ بی و دەست لەم سەفەرە هەڵگری!.

لێ ئەویش گوێی بە قسەکانی بابی نەداو پاش خوا حافیزی لە داك و بابی, ڕێی سەفەری گرتە بەر، پاش چەندین شەوو ڕۆژ ئەنجام گەییە ئەو شارەو چووە حزووری پاشاو گوتی:

- من کوڕە پاشام و هاتووم دەمەوێ زەماوەند لەگەڵ شازادەخانم دا بکەم!

پاشا گوتی:

- کوڕم، براکەت نەیتوانی شازادەخانم بدۆزێتەوە، ئەوە بوو بە داخەوە ناچار بووین لە ملی بدەین، ئێستاش تۆ چاك بیری خۆت بکەوەو ئەوجا بڕیار بدە.

لێ ئەمجارەش کوڕە بێ سێ و دوو وەڵامی دایەوە کە ئامادەیە ڕووبەڕووی چارەنووسی خۆی ببێتەوە. بۆیە دەستی بە گەڕان کرد، بەڵام سێ ڕۆژەکە تەواو بوو، و نەیتوانی شازادەخانم بدۆزێتەوە، بۆیە کاتێ ڕۆژی سێیەم خۆر ئاوابوو، پاشا دەستووریدا کە لە ملی بدەن.

کاتێ پاشا، بابی شازادە بەم هەواڵەی زانی و بۆی دەرکەوت کە کوڕی دووەمیشی لە دەست داوە، داماوە لە خەم و پەژارەدا پاك سەری سپی بوو، دایکیشی هێندە گریا کە بینایی هەردووك چاوی لە دەستدا.

بەڵام پاش ماوەیەك کوڕی بچووکی پاشا چووە لای بابی و گوتی:

- باوکە گیان، من لێبڕاوم کە بچمە تاقیبی شازادەخانمی نەشمیلو زەماوەندی لەگەڵ بکەم.

پاشا کە یەجگار غەمگین بوو، هەرچی کردو کۆشا کە کوڕە چکۆلەکەی لەم سەفەرە ژێوان بکاتەوە فایدەی نەبوو و کوڕە سوور بوو لەسەر بڕیاری خۆی. بۆیە ئەویش خوا حافیزی لە داكو بابە جەرگ سووتاوەکەی کردو کەوتە ڕێ، ئیدی پاش سەفەرێکی چەند ڕۆژە گەییە ئەو شارە. لێ شازادەی سێیەم لە بری ئەوەی وەکو برایەکانی دیکەی یەکسەر بچێ بۆ لای پاشا. سەرەتا چووە لای زەڕەنگەرێكو پاش ئەوەی دوو کیسە زێڕی دایێ و گوتی:

- تکات لێ دەکەم تا سبەی بەیانی بزنێکی زێڕین-م بۆ دروست بکەو، ئەم بزنە دەبێ ئەوەندە گەورە بێ کە من بە ئاسانی بچمە ناوییەوەو خۆمی تیا بشارمەوە، جا لە بری ئەم کارە بۆت هەیە کیسە زێڕی دووەم بۆ خۆت هەڵبگری!

کابرای زەڕنگەر کاتێ ڕاسپاردەکەی ئەم شازادە دڵاوایەی گوێ لێ بوو، بە خۆشحاڵییەوە ئەم کارەی قەبوڵ کردو خێرا دەست بە کار بوو و بە درێژایی شەو هەر کاری کردو تا سبەی بەیانی ئەو بزنە زێڕینەی، کە شازادە داوای کردبوو، ئامادە کرد، بەیانی شازادە دەچێتە موغازەکەی کابرای زێڕنگەرو پاش ئەوەی خۆی لە ناو بزنەکەدا شاردەوە، دەستوور بە زێڕنگەرەکە دەدا کە ئەم بزنە بە دیاری بۆ شازادەخانم بۆ کۆشکی پاشا بنێرێ، ئیدی کابرای زێڕنگەر بزنەکە دەدا بە کۆڵی چەند حەماڵێکداو ڕایان دەسپێرێ کە بۆ کۆشکی پاشای ببەن. کاتێ بزنەکەیان بۆ پاشا برد، پاشا بۆ ئەوەی دڵی کیژەکەی خۆشبکات، دەستووریدا کە لە دەرکۆکە نهێنییەکەوە بۆ کۆشکەکەی شازادە خانمی ببەن. کاتێ شازادەخانم چاوی بەم دیارییە جوانە کەوت زۆر خۆشحاڵ بوو و گوتی لە سووچێکی ژوورەکەیدا دایبنەن. لەم کاتەدا شازادەی لاو کە لە ناو بزنەکەدا پەنهان بوو، و خەریك بوو لە کونی چاوی بزنەکەوە تەماشای شازاداخانمی دەکرد. هەر سەری لەو هەموو جوانییە بێ وێنەیە سوڕماو بەسەد دڵ ئاشقی شازادەخانم بوو. بەڵام بۆ سبەینێ، شازادەکە شەوو ڕۆژێك بوو، لە ناو بزنەکە مابووەوە، هەستی بە برسێتییەکی زۆر کرد، بەڵام چاری نەبوو و دەبوایە تەحەمول بکاتو فزەی نەکرد. خوڵامانی شازادەخانم هەموو شەوێك سینییەکی گەورەی پڕ لە خۆشترینو بە تامترین خۆراکیان بۆ شازادە خانم دەهێنا، لێ شازادەخانمی داماو هێندە غەمگینو تەنیا بوو دەمی لە هیچەوە نەدەداو هەموو شەوێك سینییەکە بە دەقی خۆیەوە دەمایەوە. کە شازادە بەمەی زانی، هەموو شەوێ کە شازادەخانم دەنووست، بە ئەسپایی لە ناو بزنەکەوە دەهاتە دەرێو نانی دەخواردو ئەوجا دەچووەوە شوێنەکەی خۆی. شازادەخانم کە بەیانیان هەڵدەستاو سەیری دەکرد سینییەکە هیچی تیا نەماوە، زۆری پێ سەیر بوو، و پێی وابوو خزمەتکارەکەی شەوانە دێتە سەر سینییە خواردنەکە. جا بۆ ئەوەی تەمێی بکات شەوێك بە درۆوە خۆی کردە خەوو خۆی لێگرت، لێ کە پاژێکی شەو بوری، شازادە خانم بەسەرسامییەوە بینی کە لاوێکی یەجگار قۆز لە ناو سکی بزنەکەوە بە ئەسپایی هاتە دەرێو دەستی بە خواردنی خۆراکەکان کرد.... بۆیە کاتێ لاوەکە ویستی بگەڕێتەوە بۆ

شوێنەکەی خۆی، شازادەخانم کە یەجگار سەرسام بوو بوو، لە پڕ لە جێی خۆی هەستاو مۆمەکەی ژوور سەری خۆی پێکرد. ئەو دووە هەروا بە سەرسامی دەیانڕوانییە یەکترو جوانییەکەیان گرتبوونیو زمانیان بەسترا بوو، لێ ئەنجام شازادەخانم هاتە قسانو گوتی:

– ئەرێ تۆ کێیو بۆچی بەم وەزعە لێرە خۆت شاردۆتەوە؟

شازادە وەڵامی دایەوە:

– من بابایەکی شازادەم، دوو برای گەورەترم لە پێناوی دۆزینەوەی تۆدا تیاچوون، بۆیە من تەنیا بەم ڕێگەیە دەمتوانی بگەمە ئێرەو تۆ بدۆزمەوە!

بە کورتی شازادەخانم کە ئاشقی شازادەی لاو بوو بوو، بە خۆشحاڵییەوە دەستەکانی شازادەی گرتو تکای لێکرد کە لە لای ئەو بمێنێتەوە. بەم پێیە شازادە بە ڕۆژەوە خۆی لە ناو بزنە زێڕیندا دەشاردەوەو کە شەو دادەهاتو هەمووان دەڕۆییشتنو دەنووستن, دەهاتە دەرێو لەگەڵ دڵدارەکەیدا دەکەوتنە رازو نیاز، لێ ئەنجام شازادە خانم شەوێك پێی گوت:

– ئێمە ناتوانین تا هەتا هەتایە بەمجۆرە بژین، کەواتە دەبێ نەخشەیەك دابنەین کە تۆ بتوانی لێرە بچیتە دەرێو ئەوجا بچیتە لای بابمو پاش ئەوە وا بنوێنە کە دەتەوێ پەناگاکەی من بدۆزیتەوە، هەنگی دەگەینە یەکترو زەماوەند دەکەین.

پاشان هەردووکیان ماوەیەك بیریان کردەوەو ئەنجام شازادە ڕێگەیەکی هەڵاتنی وەبیرا هاتو گوتی:

– ئا ئێستا زانیم چی بکەم! ئێمە دەبێ لاقێکی ئەم بزنە زێڕینە بشکێنین ئەوجا تۆ جواب بۆ باوکت بنێری کە ئەم بزنە پێویستی بە چاك کردنەوە هەیەو، وەختێ کە بزنەکە لێرە بەرنە دەرێ، ئەوسا من دەتوانم ڕێگەکە بدۆزمەوەو لێرە بچمە دەرێ.

شازادە خانم ئەم نەخشەیەی پەسند کردو کە ڕۆژ بووەوە جوابی بۆ باوکی نارد کە لاقی بزنەکە شکاوەو داوای کرد کە بۆی چاك بکەنەوە. پاشا یەکسەر دەستووری داو کابرای زێڕنگەریان بۆ هێناو پێی گوت کە دەبێ ئەم بزنە چاك بکاتەوە. ئیدی کابرای زەڕنگەر بزنەکەی دا بە کۆڵی حەماڵداو بۆ موغازەکەی خۆی برد، لێ کە گەییە دوکان، شازادە هاتە دەرەوەو گوتی:

– زۆر چاکە، من ئیتر کارم بەم بزنە نەماوە، هەر کاتێ تەواوت کرد، دەتوانی بە بەتاڵی بۆ پاشای بنێریتەوەو ئەوجا شازادە بە پەلە خۆی گەیاندە بارەگای پاشاو بە پاشای گوت:

– من کوڕی پاشایەکمو لێبڕاوم شازادەخانم بدۆزمەوەو پاشان زەماوەندی لەگەڵدا بکەم!.

پاشا کە زۆری بەزەیی بەم لاوەشدا دەهاتەوە، زۆری هەوڵدا کە پەشیمانی بکاتەوە. لێ هەرچییەکی گوت بەگوێی شازادەدا نەچوو، و ئەنجام ڕێگەی پێدا کە دەست بە گەڕانی خۆی بکات. شازادە کە لە کەیفاندا لە پێستی خۆی نەدەهێوری هیچ خۆی شێلو نەکردو ڕۆژی

یەکەمو دووەم وا خۆی نواند کە نەیتوانیوە کۆشکە نهێنییەکەی شازادە خانم بدۆزێتەوە، ڕۆژی سێیەم چووە لای پاشاو گوتی:

– سەروەرمان ڕێگە دەدات کە ئەمڕۆش لە گەڕان بەردەوام بم؟

لەو دەمەدا مامۆستا فێڵبازەکەی شازادەخانم کە لە پشت شازادەوە وەستا بوو، بەوپەڕی ناڕەسەنییەوە هەوڵیدەدا کە بە ئاماژەی سەرو جوڵەی دەست پاشا تێ بگەیەنێ کە نابێ ڕێگەی شازادە بدات, لێ پاشا بە پێچەوانەی حەزی مامۆستای حیلەبازەوە، قاییل بوو و گوتی:

– هەڵبەتە ڕێت دەدەم کوڕم، بەڵام لە بیرت نەچێ کە ئەمڕۆ دوا ڕۆژی مۆڵەتەکەتە.

ئیدی بەم پێیە شازادە بە خۆشحاڵیەوە بەگەڵ مامۆستای ناڕەسەن، کە یەجگار تووڕە بوو بوو، کەوت، لەوێ هاتە دەرێ، بەڵام یەکڕاست بەرەو حەوزەکەی کۆشك ڕۆیی و بە مامۆستا خانمی گوت:

– دەکرێ هەموو ئاوی ئەم حەوزە بە تاڵ بکەم؟

خانم مامۆستا کە زۆر ئەمەی لەبەر گران بوو، بە تووڕەیی بەگژ شازادەدا چووەوەو ڕێی نەدا کە شازادە ئاوی حەوزەکە بەتاڵ بکات.

پاشا کە لە پەنجەرەی ژوورەکەی خۆیەوە گوێی لەم گفتۆگۆیە بوو، دڵی خەبەری دایێ کە مامۆستاکەی شازادە خانم نیازی خراپەو لەوە دەچێت ئۆینێکی تازەی لە ژێر سەردابێ، بۆیە یەکێك لە خولامەکانی نارده خوارەوەو دەستووریدا کە هەموو ئاوی حەوزەکە بەتاڵ بکات.... کاتێ کە هەموو ئاوی حەوزەکە بە تاڵ بوو، لە پڕ دەرکۆکەی کۆشکەکەی شازاداخانم بە دیارکەوت و شازادە بە مامۆستا خانمی گوت:

– من دەمەوێ ئەم دەرکەیە بکەمەوە.

مامۆستا خانم کە زۆر توڕە بوو بوو دیسانەوە کەوتە بیری ئەوەی نەخشەیەکی شەیتانی دیکە بکێشێت و گوتی:

– زۆر چاکە، بەڵام تۆزێ سەبربکە تا من دەچم کلیلەکەی دێنم!

خۆی بە کۆشکەکەدا کردو، پاش ماوەیەك بە دەستەیەك کلیلەوە گەڕایەوەو دەرکەکەی کردەوە، لێ کاتێ شازادە ویستی خۆی بە دەرکۆکەکەدا بکات، مامۆستا خانم گوتی:

– سەبر بکە، دەبێ من یەکەمجار وەژوور بکەوم و پاش تۆزێك گازت دەکەم کە وەژوور بکەوی و بە پەلە لە دەرکۆکەکەوە وەژوور کەوت، لێ لە جیاتی شازادە گاز بکات، بە پەلە جلەکانی شازادە خانمی داکەندو جلو بەرگی کیژێکی کارەکەری لەبەر کردو پاش ئەم کارە هەموو کارەکەرو قەرەواشەکانی شازادەخانمی لەوێ و لە دەوری شازادەخانم خڕ کردەوەو خولاسە دیمەنێکی دروست کرد کە جیاکردنەوەی شازادەخانم لە کیژەکانی دیکە مەحاڵ بێ.

ئەنجام شازادەی گاز کردو گوتی کە ئێستا دەتوانێ بێتە ناو کۆشکەکەوە. لێ کاتێ شازادە وەژوور کەوت زۆری پێ سەیر بوو کە سەدان کیژی یەك شێوەو هاو جۆر لەوێندەر

بوون، هەر چەند دیقەتیدا نەیتوانی شازادە خانمیان لە نێواندا بناسێتەوە. لەم دەمەدا ماموستا خانمی فێڵباز گوتی:

– ئێ، شازادەخانم یەکێکە لەم کیژانە، بۆ خۆت بگەڕێ‌و بیدۆزەوە!

شازادە نەیدەزانی چۆن شازادەخانم لە نێو ئەو ئاپورایەدا بدۆزێتەوە، لێ لەنکاو بیرێکی بە مێشکدا هات‌و یەك مشت سکەی زێڕی لە بەرکی دەرهێناو هەڵیڕشتە سەر ئەرزەکە، لەم دەمەدا لە پڕ هەموو کیژەکان دانەوینەوەو کەوتنە هەڵگرتنەوەی پارەکان لەسەر ئەرزەکە... تەنیا یەك کەسیان نەبێ کە لە جێی خۆی وەستاو بۆ پارەکان دانەنەوییەوە! ئەوە شازادەخانم بوو.

ئەم مەسەلەیە نیشانەی ئەوە بوو کە ئەو لەوانی دیکە جیاوازە، ئەگەرچی جلوبەرگی کارەکەری لەبەر کردبوو، بەڵام گۆنای ئاڵ‌و رووی جوانی هاواریان دەکرد کە "من پاشا زادەم". هەروەها نەفسبەرزییەکەی لەوانی دیکەی جیا دەکردەوە. ئەمە جگە لەوەی کە شازادە پێشتر ئەوی بینی بوو، ئیدی شازادە دوای ئەم بیرانە یەکڕاست بەرەو شازادەخانم رۆیی‌و باسکی ئەوی گرت‌و هێنایە پێشەوە. ئەوجا پێکەوە چوون بۆ لای پاشاو گوتی کە شازادە خانمی دۆزیوەتەوە، پاشا کە زۆر خۆشحاڵ دەهاتە بەرچاو، یەکسەر دەستووریدا کە کیژەکەی ببێ بە هاوسەری ئەم شازادە لاوو دلێرە. بەڵام ئەجام وەختێ پاشا هەموو حیکایەت‌و پیلانە شەیتانییەکانی ماموستا خانمی نەگریسی بۆ دەرکەوت، دەستووریدا کە لە سەری ئەو ژنە خوێن مژو دڵڕەقەی کە بوو بووە مایەی مەرگی سەدان گەنج، بدرێ‌و بە سزای کردەوە نەنگینەکانی بگەیەنن، ئیدی دەم‌و دەست بە جەلاد سپێردراو سەری خرایە سەر هەمان ئەو بورجەی کە خۆی دایمەزراندبوو، ئەوسا دایك‌و بابی شازادەی لاو بۆ ئاهەنگی زەماوەندی شازادەو شازادەخانم دەعوەت کران‌و پاش چل شەوو چل رۆژ دەهۆڵ‌و زورناو زیافەت شازادەخانم‌و شازادەی لاوو دلێر بوون بە هاوسەرو ساڵەهای ساڵیان بە خۆشی‌و شادی پێکەوە بەسەر برد.

## بلور

هەبوو نەبوو، کەس لە خوا گەورەتر نەبوو. کیژێك هەبوو ناوی بلور بوو. بلور کیژێکی گەلەك جوان و نەشمیل بوو، دەمو چاوی هێندە سپی بوو لە تۆ وایە بەفرە، هەر لە منالێییەوە دایکی مرد بوو و ئێستا لەگەڵ باوەژنەکەی و زڕخوشکەکەیدا، کە کیژێکی بەجگار ناشیرین و رەش بوو دەژیا. باوەژنەکەی بلور کە ژنێکی گەلەك ناڕەسەن و دڵڕەش بوو، نەك هەر بلوری ئازار دەدا، بەڵکو هەموو داراییەکەشی، کە بریتی بوو لە کەڵەشێرێکی جوان و گوێرەکەیەکی بچووك، داگیرکردبوو، و رێگەشی نەدەدا لە گیانلەبەرە میهرەبانەکانی نزیك ببێتەوەو هەمیشە وەکو کارەکەرێك دەیچەوساندەوەو هەموو خەڵکی و دەرو دراوسێکانیان وایان دەزانی کە بلوری داماو کارەکەری ئەمماڵەیە.

رۆژێك، باوە ژنەکەی بلور کۆمەڵێك دەزووی ئاڵۆزکاوی دەداتێ و دەڵێت:

– کیژێ، برۆ ئەم دەزووانە بڕێسەو دەبێ ئەمشەو هەمووی تەواو بکەی و بۆ منی بهێنیتەوە!

لێ بلوری داماو کە نەیدەزانی چۆن ئەم هەموو دەزووە تا شەوێ بڕێسێ. بۆیە بە دەم فرمێسك رشتنەوە گوتی:

– ئاخر دایە گیان، من چۆن ئەم هەموو کارەم تا شەوێ پێ تەواو دەکرێت!

باوەژنەکەی بە توڕەیی گوتی:

– قسەی زیاد مەکە ئەگەر بتەوێ و هەوڵبدەی لەمەش زیاترت پێ دەکرێ!

ئیدی بلور خەمبارو دڵتەنگ دەزووەکانی هەڵگرت و بەرەو شار کەوتە رێ تا بیڕێسێت، بەدەم رێوەو بە گریانەوە بەخۆی دەگوت:

– ئەی خوایە گیان، ئەگەر تا شەوێ تەواو نەبێ من چبکەم!

بەدەم ئەم خەیاڵانەوە گەییە کەنار رووبارێك و لەم کاتەدا کە پیرەژنێك لەوێندەرەوە تێدەپەڕی، هەستی بە فرمێسکەکانی کیژۆلەکە کردو بە میهرەبانییەوە پرسی:

– چی بووە کیژم، بۆچی دەگریت؟

بلور وەڵامی دایەوە:

– هەر مەپرسە دایە گیان، چۆن لە دەستی باوەژنی بێویژدان نەگریم، داوای لێکردم ئەم هەموو دەزووە تا شەوێ بڕێسم و بۆی ببەمەوە!

پیرەژن کە هۆی گریانەکەی کیژێی بۆ دەرکەوت، کەوتە دڵدانەوەی و گوتی:

– راست دەکەی، کارێکی زۆر زۆرو قورسە، بەڵام پێویست ناکا بگریت، ئەگەر بە دوای مندا بێی، فێرت دەکەم کە چۆن ئەم کارە بکەی:

ئەوجا پیرەژن، بلوری لەگەڵ خۆیدا بۆ کوختەکەی خۆی بردو پێی گوت:

- زۆر چاکە، ئەوەی تۆ لەسەرتە ئەوەیە کە تۆ قژی من شانە بکەی و من ئەم دەزووانە دەدەم بەو مانگایەی کە لە حەوشەدایە، تا تۆ قژی من شانە دەکەی، مانگاکە هەر هەموویت بە ددان بۆ دەڕێسیّ!

بەمجۆرە کیژێ بە قسەی پیرەژن کەوتە شانەکردنی قژی.

پیرەژنیش لەبری ئەمە دەزووەکانی دا بە چێڵەکەو پیرە چێڵ کەوتە رستنی دەزووەکان، کە کیژێ لە شانەکردنی قژی پیرەژن بووەوە، پیرەژن کە ئەم کیژە میهرەبان و گوێڕایەڵەی زۆر چوو بووە دڵەوە پێی گوت:

- کچەکەم، کەمێك لە سەرووی ئێرەوە، رووبارێك هەیە کە ئاوەکەی سپییەو دەبیّ بچی بۆ ئەوێندەرو دەموچاوت لەو ئاوە بشۆی، تۆزێك لە سەروتری ئەوێوە تووشی روبارێکی دیکە دەبی کە ئاوەکەی رەشەو دەبیّ لەو ئاوە تەنیا قژو برۆو چاوەکانت بشۆی، ئەنجام دەگەیە روباری سێیەم کە ئاوەکەی سوورەو دەبیّ تەنیا گۆناو لێوت لەو ئاوە بشۆی!

بەمجۆرە بلور لە ماڵەکەی پیرەژن وەدەرکەوت و هەر رۆیی و رۆیی تا گەییە روبارێك کە ئاوەکەی سپی بوو. دانەوییەوەو دەموچاوی لە ئاوەکەدا شۆرد، لە پڕ دەموچاوی زۆر جوانتر سافتر بوو، دەموچاوی وەکو ئاوێنە کەوتە درەوشانەوە، بلور دیسان کەوتەوە رێ و گەییە روبارێك کە ئاوەکەی رەش بوو، لەم روبارەش قژو برۆو چاوی شتن و لە پڕ قژو برۆو چاوی بریقەیەکی وەهایان پەیدا کرد چاویان دەخستە رێشکەوپێشکە. ئەنجام وەختێ گەییە ئەو رووبارەی کە ئاوەکەی سوور بوو و لێوو گۆنای لەو ئاوە شۆرد، لێوەکانی وەکو خونچەو گۆناکانی وەکو گوڵ رەنگین و جوان بوون، بە هەر حاڵ بلور وەختێ هەموو ئەو کارانەی تەواو کرد کە پیرەژن پێی گوتبوو، گەڕایەوە بۆ لای. پیرەژن پێی گوت:

- پەلە بکە کیژم، زۆر درەنگە، خێرا دەزووە رێسراوەکانت لە چێڵەکە وەربگرەوەو بڕۆرەوە بۆ ماڵی خۆتان! ئیدی بلور، دەزووەکانی، کە زۆر بە جوانی و دیقەت رێسرابوو، هەڵگرت و بە پەلە بەرەو ماڵی خۆیان وەڕێکەوت. کە گەیشتەوە بەر ماڵەوە، بینی زڕدایکەکەی کە زۆر تووڕە دیار بوو، لەبەر دەرگایەو چاوەنۆڕی ئەوە. لێ کاتێ بینی بلور سەد هێندەی دی جوانتر بووە، هێندەی تر تووڕە بوو و ئەوجا پرسی:

- کارەکەت تەواو کردووە؟

بلور وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ دایە گیان، ئەمە هەموویەتی.

وەختێ باوە ژنەکەی بە توڕەیی دەزووەکانی لێ وەرگرت و بینی زۆر بە جوانی رێسراوەو بچووکترین عەیبی نییە، بە بۆڵە بۆڵ بلوری بردە ژوورەوە، بلور، بەوە خۆشحاڵ بوو کە باوە ژنەکەی لێی نەدا، بۆیە دەستی بە گێڕانەوەی ئەو واریقاتە کرد کە بەسەری هاتبوو.

رۆژی دواتر، ژنە کە زۆر بە غیلی بە بلور دەبردو خەریك بوو لە داخا شەق بەرێ، کیژەکەی خۆی گاز کردو دوای ئەوەی تۆزێ دەزووی دایێ، پێی گوت:

- وەرە کیژە ئازیزەکەم، ئەم دەزووانە لەگەڵ خۆتدا بۆ شار ببەو هەر کە گەییشتیە ئەوێندەر دەست بە رستنیان بکە، لێ لە بیرت نەچێ کە شەوێ گەڕایتەوە بۆ ماڵ دەبێ وەکو بلور جوان بووبی!

بەم جۆرە کیژێ کە زۆر کچۆڵەیەکی تەمەڵ و روو گرژیش بوو، دەزووەکانی هەڵگرت و بەرەو شار کەوتە ڕێ و بەدەم ڕێگاوە دەگریاو بەخۆی دەگوت:

- ئاخ، ئاخر دایکم بیر ناکاتەوە کە من چۆن چۆنی ئەم هەموو دەزووە تا شەوێ بڕێسم!

لەم دەمەدا تووشی هەمان پیرەژن بوو و کە بینی کیژێ دەگری، پرسی:

- کچەکەم بۆچی دەگریت؟

کیژێ تۆزە دەزووەکەی نیشانی پیرەژنداو گوتی:

- ئاخر دایە گیان چۆن نەگریم! دایکم ئەم هەموو دەزووەی داومەتێ بیڕێسم و تا شەوێ کارەکەم تەواو بکەم!

پیرەژن بەسەرسامی پرسی:

- ئێ، دایکت تەنیا ئەم کارەی لێت ویستووە؟

کیژێ وەڵامی دایەوە:

- نه ء، داوای لێکردووم کە شەو بۆ ماڵ گەڕامەوە دەبێ وەکو بلوری زڕ خوشکم جوان و نەشمیل بووبم!

پیرەژنەکە، بە میهرەبانییەوە گوتی:

- زۆر چاکە، ئەمە گریانی ناوێ، بە دوای مندا وەرە تا پێت بڵێم چ بکەی!

ئەمجارەش کیژێی بۆ ماڵەکەی خۆی بردو لەوێ دەزووەکانی لە کیژێ وەرگرت و دایە مانگاکەی تا بۆی بڕێسێ. لێ ئەمجارە چێڵی پیرەژن هیچ گوێی بەکیژێ نەداو دەزووەکەی زۆر بە خراپی بۆ رست، لەم دەمەدا پیرەژن بە کیژێی گوت:

- وەرە کیژم, وەرە قژی من شانە بکە.

لێ کیژێ، بە پێچەوانەی بلورەوە، کیژێکی زۆر تەمەڵ بوو، و بە بێتاقەتی و نەبەدڵی کەوتە شانەکردنی قژی پیرەژن. وەختێ پیرەژن ئەم بێ سفەتیەی ئەم کیژە بێ ئەدەبەی بینی، هیچ نەچووە دڵییەوەو زۆر تووڕە بوو و بە کیژێی گوت:

- کچەکە گیان، تۆزێ لەسەرووی ئێرەوە روبارێك هەیە کە ئاوەکەی سپییەو دەبێ قژو برۆکانت لەو ئاوە بشۆی. ئەوجا تۆزێ لەسەرووتری ئەم رووبارەوە دەگەیتە رووبارێك کە ئاوەکەی رەشەو دەبێ لەو ئاوە دەموچاوەت بشۆی. ئەوجا کەمێ لە سەرووتر دەگەیتە روبارێکی دیکە کە ئاوەکەی سوورەو دەبێ کەپوو و گوێیەکانت لەم ئاوەدا بشۆیت!!.

کیژێ کە گوێی لەم قسەیە بوو بە خۆشحاڵییەوە بەرەو ئەو رووبارە رۆیی کە پیرەژن پێی گوتبوو، لە ئاوی روباری یەکەمدا کە سپی بوو، قژو برۆی شت و ئەوجا تۆزێ لەسەرووتر

گەییە روباری ئاوە رەش‌و دەموچاوی لێ شۆرد، ئەنجام گەییە روباری ئاوە سووروو بە گوێرەی قسەکەی پیرەژن کەپوو و گوێچکەکانی لەو ئاوە شۆرد، پاش ئەم کارە، کیژێ کە زۆر ناشیرین بوو بوو، بۆ ماڵی پیرەژن گەڕایەوە، پاش ئەوەی دەزووەکانی، کە مانگاکە بۆی رستبوو، لە پیرەژن وەرگرت، بەرەو ماڵی خۆیان کەوتە رێ، لێ کاتێ گەییشتەوە ئەوێندەر، دایکی کە لەبەر دەرگای ماڵەوە چاوەڕوانی دەکردو لە دڵی خۆیدا وایدەزانی کە ئێستا ئەویش وەکو بلور جوان بووە، کاتێ چاوی بە سیمای پێکەنیناوی‌و ناشیرینی کیژەکەی کەوت‌و سەیری کرد دەزووەکانی زۆر خراپ رستووە، ئەوەندە پەست بوو لە داخی دڵی خۆی دارکارییەکی باشی کرد.

بەمجۆرە رۆژ بە رۆژ باوە ژنەکەی بلور پتر رقی لە بلور هەڵدەگرت‌و بەغیلی پێدەهات‌و هەمیشە لە دڵی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن چۆنی پتر ئەزیەتی بدات، ئەوە بوو رۆژێك بیرێکی بەمێشکدا هات‌و بڕیاریدا ئەو گوێرەکە بچووکەی کە بلور زۆری خۆشدەویست‌و لە دایکییەوە بۆی مابووەوە بکوژێتەوەو بەمجۆرە تۆڵە لە بلور بکاتەوە. پاش ئەم بڕیارە بلوری بانگ کردو گۆزەیەکی گەورەی نیشان داو گوتی:

– دەبێ سبەینێ هەموو کەل‌و پەلەکان بشۆی، کەواتە ئەم گۆزەیە بەرە لە سەرچاوەکە پڕی بکەو بۆ ماڵی بێنەوە.

لێ کاتێ بلور کە کچۆڵەیەکی زۆر لەڕو لاواز بوو، ئەو گۆزە قورسەی بردە سەر کانی‌و تەژی ئاوی کرد، هەرچی کردو کۆشا نەیتوانی لە عاردی بەرزی بکاتەوە. لێ لە ترسی باوەژنەکەی، نەیدەوێرا بەبێ گۆزە ئاو بۆ ماڵ بگەڕێتەوە.

بۆیە هەر لەسەر کانییەکە دەستی بە گریان کرد. لێ پاش چەند دەمێك وەختێ بلور سەری هەڵبڕی، هەمان پیرەژنی بینی کە لە بەردەمیدا وەستا بوو. پیرەژن پرسی:

– کچەکەم دیسان چیت لێقەوماوە وا لێرە دانیشتوویت‌و دەگریت؟

بلور بە دەنگێکی خەمین بەرسڤی دایەوە:

– باوەژنم، منی بەم گۆزە قورسەوە بۆ ئێرە ناردووە کە ئاوی بۆ ببەم، بەڵام من دەزانم‌و دڵم خەبەری داوە کە ئەو دەیەوێ لە غیابی مندا گوێرەکە چکۆڵەکەم، کە تاقە یادگاری دایکمە، بکوژێتەوە.

پیرەژن کە گوێی لەم قسەیە بوو، دەستی بە قژی کچۆڵەکەدا هێناو گوتی:

– زاتت هەبێ کیژم، ئەمە شتێکی گرنگ نییەو بە خۆڕایی خەفەت مەخۆ، تۆ باش گوێ لە من بگرە... کاتێ باوەژنت گوێرەکەکەی کوشتەوە، ئاگاداربە دەم لە گۆشتەکەی نەدەی، هەر بەو دەقەوە بیبەو لە شوێنێکدا بیکە ژێر خاکەوە. ئەوجا هەموو شتێك دووبارە وەکو خۆی لێدێتەوە...!

لەولاشەوە، باوەژنە نارەسەنەکەی بلور، کە بلوری بە بیانووی ئاوەوە لە ماڵ وەدەرنا، خێرا چووە سۆراخی گوێرەکەکەی بلورو کوشتییەوە. کاتێ بلور بۆ ماڵ گەڕایەوەو زانی کە گوێرەکەکەی کوشتوەتەوە، وێڕای ئامۆژگارییەکانی پیرەژن، لە داخ‌و حەژمەتان دەستی بە

گریان کرد، لێ لەم کاتەدا ئامۆژگارییەکانی پیرەژنی وەبیر هاتەوەو کەلاکی گوێرەکەکەی هەڵگرتو لە ماڵ بردییە دەرەوەو لەو نزیکانەو لە جێیەکدا بە خاکی سپارد.

چەند مانگێك بوری، تا رۆژێك جارچییانی پاشا کەوتنە ناو جادەو شەقامانو جارِیان دا کە ئەی خەڵکینە سبەینێ ئاهەنگی زەماوەندی کورە تاقانەکەی پاشایە، کە شازادەیەکی زۆر قۆزو لاو بوو. بۆ سبەینێ باوەژنەکەی بلور، کە دەیویست لەگەڵ کیژەکەی خۆیدا بۆ شاییەکەی شازادە برِوات، سینییەکی گەورەی دایە بلورو کە یەك دنیا برنجو خۆڵەمێشی بەسەرەوە بوو، و دەستووریدا بە بلور کە دەبێ ئەو رۆژە لە ماڵ دانیشێو تا ئێوارێ ئەم برنجانە لە خۆڵەمێشەکە جیا بکاتەوە. ئەوجا دەستی کیژەکەی خۆی گرتو چوون بۆ ئاهەنگی زەماوەندی شازادە.. ئیدی کچۆڵەی نەگبەت چاوێکی بە سینییەکدا گێراو لە دڵی خۆیدا گوتی: ئاخر من چۆن دەتوانم ئەم برنجە لەم خۆڵەمێشە جیا بکەمەوە.

لێ کاتێ کە بلور بە خەمینی لە سووچێکدا دانیشتبوو و خۆی دەدواند، دەرکەی ماڵەکەیان ڤەبوو و هەمان پیرەژنی جاران وەژوور کەوتو گوتی:

– دیسان چی بووە کیژە ئازیزەکەم، بۆ خەمباری ئەدی تۆ بۆ زەماوەندی شازادە نەچوویت؟

بلور بە دەنگێکی خەمگین وەڵامی دایەوە:

– دایکە گیان، بە خۆت دەبینی کە ئەم باوەژنە دڵرەقەی من ئەم هەموو برنجەی تێکەڵ بەم خۆڵەمێشە کردووەو داوای لێکردووم کە تا خۆرئاوا جیای بکەمەوە! ئاخر من چۆن دەتوانم ئەم کارە بکەم؟

پیرەژن گوتی:

– خەمت نەبێ کیژم, من تەگبیرت بۆ دەکەم.

ئەوجا لە ماڵەکە وەدەرکەوت، دوای کەمێك بە مریشکێکەوە گەرِایەوە. ئەوجا مریشکەکەی دانایە عاردی، مریشکی تاین کەوتە چینە کردنو ئەجام هەموو برنجەکەی خوارد، ئەوجا پیرەژن هات مریشکەکەی کوشتەوەو هەموو برنجەکەی لەسکی هێنایە دەرێو روویکردە بلورو گوتی:

– ئێ ئەم کارە تەواو. ئێستا کیژەکەم، بچۆ بۆ ئەو شوێنەی کە گوێرەکەکەت لێ ناشت، چونکە شتێکی زۆر چاك لەوێندەر چاوەرِوانت دەکات... پاشان دەبێ گیرفانێکت پرِ لە خۆڵەمێشو گیرفانەکەی ترت پرِ لە زێرِ بکەیو بچی بۆ کۆشکی پاشاو ئاهەنگی زەماوەندی شازادە! وەختێ گەییشتیە ئەوێندەر، خۆڵەکەوەکە بەسەر باوەژنەکەتو خوشکەکەت هەڵبدەو زێرِەکانیش بەسەر میوانەکانی دیکەدا هەڵبدە، لێ لە بیرت نەچێ کە نابێ زۆر لەوێندەر بمێنیتەوەو دەبێ بەر لە نیوەشەو بۆ ماڵ بگەرِێیتەوە!

هەر کە پیرەژن لە قسەکانی بووەوە، بلور بەرەو گۆرِی گوێرەکەکە رۆیی، لێ کە گەییە ئەوێندەر واقی ورِما، سەیری کرد دەستێ جلکی یەجگار جوانو گرانبەهاو جووتێ پێڵاوی ئەڵماس نیشانو ئەسپێکی سپی زین زێرِ لەوێندەر ئامادەیە کە ئەو سواری بێ، ئیدی بلور

به خۆشحاڵییەوە خێرا جلە جوانەکانی لەبەر کردو پاشان پێڵاوە ئەڵماس نیشانەکانی لە پێ کردو سواری ئەسپەکە بوو و بەرەو کۆشکی پاشا وەڕێکەوت.

بلور، کە بەم جلانەوە هەزار ئەوەندەی جاران جوانتر بوو بوو، کە گەییە ناو کۆڕی زەماوەندەکەی شازادە، هەموو میوانەکان کە وایاندەزانی شازادەخانمێکە، کڕنۆشیان بۆ بردو هەموو سەرسامو حەیران کەوتنە چپەچپو باسی جوانی ئەو. کە شەو درەنگ بوو و بلور ویستی بڕوات هەموو میوانەکان کە وەکو پەپوولە لە دەوری ئەو خڕ بوو بوونەوە، گوتیان.

– شازادەخانم–ی زیبا تکا دەکەین کەمێکی تریش لێرە بمێنەوە!

لێ بلور بە نیگەرانی وەڵامی دایەوە:

– ئاخر خەریکە دەبێ بە نیوە شەوو دەبێ پەلە بکەم!

لەم کاتەدا، وەکو چۆن پیرەژنەکە ئامۆژگاری کردبوو، پاش ئەوەی چنگێ خۆڵەمێشی بەسەر باوەژنەکەیو خۆشکەکەیدا هەڵدا، زێڕەکانی بەسەر میوانەکانی تردا پەخش کردو ئەوجا بەپەلە سواری ئەسپەکەی بوو و بەرەو ماڵ وەڕێکەوت. لێ بلور کە زۆر پەلەی بوو، لە پەلە پەلیدا, لە ڕێگە وەختێ بە دۆڵێکدا ڕەتدەبێ، تاکێ لە پێڵاوە ئەڵماس نیشانەکانی لە دەوەنێك گیر دەبێو بە تاکێ پێڵاوەوە دەگاتەوە ماڵێ. یەکسەر ئەسپەکەی لە سوچێکی دوور لە ماڵ شاردەوەو جلەکانی داکەندو هەمان جلە کۆنو دڕاوەکانی خۆی لەبەر کرد...

لەولاشەوە، هەر ئەو شەوە کاتێ باوەژنەکەیو خوشکەکەی لە شایی دەگەڕانەوە، بە یەکتریان دەگوت:

– کە زەماوەندێکی خۆش بوو و چەند شتی جوانمان بینی... ئەو شازادە خانمەت بینی کە زێڕی بەسەر میوانەکاندا هەڵدەدا، کە جوان بوو؟!

جا با بێینە لای شازادە، بە ڕێکەوت سبەینێی ئەو ڕۆژە وەختێ شازادەی لاو دەچێ بۆ ڕاو، بە سواری ئەسپەکەی بە دۆڵێکدا ڕەت دەبێ، لە پڕ ئەسپەکەی لە جێی خۆی دەوەستێو دەحیلێنێ. شازادە کە سەری لەمە سوڕ دەمێنێو نازانێ ئەسپەکەی بۆچی وەستا، دەڕوانێتە دەوروبەری خۆی. لەپڕ چاوی بە تاکە پێڵاوێکی ئەڵماس نیشان دەکەوێ کە بە دەوەنێکەوە هەڵواسراوە. ئیدی دەستوور بە خوڵامەکەی دەدات کە ئەو تاکە پێڵاوە هەڵبگرێو بۆی بێنێ. کاتێ شازادە ئەم تاکە پێڵاوە ئەڵماس نیشانەی، کە زۆر جوان بوو، بە دەستەوە گرت، بەسەرسامی بە خۆی گوت: بێگومان دەبێ خاوەنی ئەم پێڵاوە کیژێکی یەجگار جوانو نەشمیل بێ، من جگە لە خاوەنی ئەم تاکە پێڵاوە چ کەسێکی تر ناهێنم!

پاش ئەوە، بە دەستووری شازادە، کە لە نەدیتەو بە سەد دڵ ئاشقی خاوەنی ئەم تاکە کەوشە بوو بوو، لە هەموو شاردا جاڕدرا کە شازادە دەیەوێ زەماوەند لەگەڵ کیژێك دا بکات کە ئەم تاکە پێڵاوە بە پێی بکات. لێ خوڵامانی شازادە هەر چەند گەڕانو ئەم ماڵو ئەو ماڵیان کرد، ئەم تاکە پێڵاوەیان لەپێی کیژانی شار کرد، خاوەن ئەم پێڵاوە جوانەیان نەدۆزییەوەو بە ئەندازەی پێی هیچ کیژێك نەبوو. ئەنجام وەختێ سەربازانی شا گەیینە ماڵی

باوەژنەکەی بلور، ویستیان پێڵاوەکە بە پێی زڕخوشکە ناشیرینەکەی بلوریش بگرن. دیارە پێڵاوەکە بە پێی ئەویشی نەکردو بچووك بوو. بۆیە دایکی بە دزییەوە پەنجەکانی پێی کیژەکەی بڕیو بەزۆر پێڵاوەکەی لە پێی کیژەکەی کردو بە سەربازەکانی شای نیشاندا کە پێڵاوەکە بە ئەندازەی پێی کیژەکەیەتی لەم لاشەوە باوەژنی ناڕەسەن، بۆ ئەوەی سەربازانی شا بلور نەبینن, بلوری لەناو تەنوری ئاشخانەکەدا شاردبووەوە، کە سەربازەکان ویستیان کیژێ بۆ کۆشکی شا بەرن، لەم کاتەداو لەپڕ کەڵەشێرەکەی بلور، کە زۆری خۆشدەویست، بە دەنگی بەرز کەوتە خوێندن.

– قوقو، بلور خانمی نەشمیل لە تەنورەکەدایە، قوققوو...

باوەژنەکەی بلور، بە توڕەیی و خێرا چووە نێو حەوشەو کەڵەشێرەکەی گرت و لە سوچێکا حەپسی کرد، بە هەر حاڵ سەربازەکان کە دیتیان پێڵاوەکە بە ئەندازەی پێی کیژی ئەم ژنەیە، کیژێیان لەگەڵ خۆدا بۆ کۆشکی پاشا برد، تا ببێ بە هاوسەری شازادە!

بەڵام باوەژنی ناڕەسەن هێشتاش هەر لە بلور دەترساو، بەردەوام لە دڵی خۆیدا دەیگوت: چۆن بتوانم خۆم لە شەڕی ئەم کیژە رزگار بکەم!

ئەنجام رۆژێ ژنێکی سیحرباز هاتە بەر ماڵی ئەوان. باوەژنەکەی بلور سەبەتەیەك سێوی دایێ و بلوری گازکرد و گوتی:

– ئەم سەبەتەیە هەڵگرەو بۆی بەرە بۆ ماڵەوە.

بلور لەگەڵ ژنەدا بەڕێکەت. بەڵام پاش ماوەیەك ڕێکردن، کە دنیا بەرەو تاریکی دەچوو، بلور بە ناڕەحەتی بە ژنەی سیحربازی گوت:

– ڕێگەم دەدەی کە من بۆ ماڵ بگەڕێمەوە، چونکە دنیا تاریك بووە، دوایی من ڕێگە گوم دەکەم.

لێ لەم کاتەدا ژنەی سیحرباز کە ویستی سەبەتە سێوەکە لە بلور وەربگرێ، بە ئانقەست سەبەتەکەی بە عاردیدا داو هەموو سێوەکە رژایە سەر عاردی و ئەوجا گوتی:

– ئۆی, ئەوە چیت کرد کیژی باش؟ خێراکە کۆیان بکەوەو بیانکەوە ناو سەبەتەکە! بەڵام کاتێ بلور خەریکی کۆکردنەوەی سێوەکان بوو، لە پڕ ژنەی سیحرباز غەیب بوو و بلور بە تەنیاو سەرگەردان لە وێندەر مایەوە. بە کورتی بلوری داماو کە زۆر ترسا بوو و نەیدەزانی لە چ ڕێیەکەوە بۆ ماڵی خۆیان بگەڕێتەوە، ناچار پەنای بردە ژێر درەختێکی ئەونزیکانەو شەو لەوێندەر خەوت. کە رۆژ بووەوە، بلور لە خەو هەستا، وەختێ روانییە دەوروبەری، لە دوورەوە چاوی بە دووکەڵێك کەوت کە لە دووکەڵکێشی ماڵێکەوە بەرز دەبووەوە. ئیدی بە خۆشحاڵییەوە بەو ئومێدەی کەماڵ و ئاوەدانییەك لەو ناوە بێ، بەرەو دووکەڵەکە بەڕێکەوت، وەختێ گەییە ئەوێندەر سەیریکرد لەبەردەم ماڵێکی گەورەدا وەستاوە. بە دوو دڵییەوە خۆی بە ماڵەکەدا کرد، بەڵام ئەمە ماڵێکی زۆر سەیر بوو. حەوت دەست نوێن و حەوت دەست قاپ و حەوت دەست چەتاڵ، حەوت دەست مراك... و بەکورتی لە هەر شتێك حەوت دەست لە ماڵەکەدا بوو. بەڵام چەندی

گەڕا هیچ زیندەوەرو ئادەمیزادێکی لەو ماڵەدا نەبینی. ئیدی زانی کە ئەم ماڵە هی دێوانە.. بۆیە بڕیاری دا تا دێوەکان لە ماڵەوە نین، ماڵەکە گسک بداتو پاك و خاوێنی بکاتەوەو خواردنێکی باشیان بۆ لێ بنێ. کاتێ هەموو ئەم کارانەی کرد، چووە سووچێکەوەو خۆی شاردەوە. کە شەو داهاتو دێوەکان بۆ ماڵ گەڕانەوە، زۆریان پێ سەیر بوو کە هەموو ماڵەکە گسك دراوەو خاوێن کراوەتەوەو خواردنیش لەسەر ئاگرەو قوڵە قوڵ دەکوڵێ!، دێوەکان بە سەرسامییەوە بە یەکتریان گوت: کێ هاتۆتە ئێرەو ئەم کارانەی کردووە؟

لێ هەر چەند گەڕان چ کەسێکیان نەدۆزییەوەو پتر سەرسام بوون.. بەمجۆرە کە دێوەکان بە رۆژەوە لە ماڵ دەچوونە دەرێ، بلور لە پەناگاکەی خۆی وەدەردەکەوتو پاش ئەوەی ماڵەکەی خاوێن دەکردەوەو خواردنێکی بەلەزەتی بۆ ئەوان لێدەنا، ئەوجا بەر لە هاتنەوەی دێوەکان خۆی لە پەناگاکەیدا دەشاردەوە. دێوەکان کە رۆژ بە رۆژ پتر سەریان سوڕدەما، هەر چەند بیریان دەکردەوە، ئەقڵیان بە هیچ کوێ را نەدەگەیی و ئەنجام هەرە بچووکەکەیان گوتی:

– من بڕیارم داوەو دەبێ بزانم کێ ئەم کارانە بۆ ئێمە دەکات.بەمجۆرە بۆ سبەینێ وەختێ دێوەکان لە ماڵ وەدەرکەوتن ئەو خۆی لە سوچێکا حەشارداو چاوەنۆڕ بوو. وەختێ کچۆڵەکە لە پەناگاکەی وەدەرکەوتو دەستی بە گسکدانی ماڵەکە کرد، لە پڕ دێوە لاوەکە راپەڕیو گرتی. بلور کە زۆر ترسابوو, بە ناچاری سەرگوروشتەی خۆی بۆ گێڕایەوە پێی گوت کە چۆن گەییوەتە ئێرە.

دێوەکە کە دڵی بە حاڵی بلور سوتا بوو گوتی:

– من بچووکترین دێوی ئەم ماڵەم، ئێمە حەوت براینو ئەمشەو کە هاتنەوە داوایان لێدەکەم کە ئازارت نەدەن. بەڵام کاری ئاقڵانە ئەمەیە کە بەر لەوەی چاویان بە تۆ بکەوێ من نانیان بدەمێ تا بیخۆنو تێر بنو، ئیدی هەقیان بەسەرتەوە نەبێ!

بە هەر حاڵ کە شەو داهات، شەش دێو بۆ ماڵ گەڕانەوە، دێوە بچووکەکە نانی دانێ، پاش ئەوەی نانیان خوارد، کچۆڵەکەی لە پەناگاکە هێنایە دەرێ، ئیدی دێوەکان کە زۆریان کەیف بەم حاڵە هاتبوو, سوپاسی کیژێیان کردو پێیان گوت: ئەگەر حەزی لێ بێ دەتوانێ لەو ماڵەدا لەگەڵ ئەواندا بژێ، بۆ سبەینێ وەختێ دێوەکان دەیانویست بچنە دەرێ، کیژێیان گازکردو ئامۆژگارییان کرد:

– تۆ نابێ هەرگیز دەرگا لە هیچ کەسێك بکەیتەوە.

بەمجۆرە بلور لە ماڵی ئەم حەوت دێوەدا مایەوەو رۆژی دەگوزەراند. بەڵام رۆژێك کە ئەم هەواڵە بە ژنەی سیحرباز گەیی بوو، هاتە بەر دەرگای ماڵی دێوەکانو گوتی:

– بلور، بلور، بەرخۆڵەکەم دەرگا بکەوە!

بلور لەو دیو دەرگاکەوە وەڵامی دایەوە:

– بەڵام ئەم دەرگایە قفڵەو من ناتوانم دەرگا لە کەس بکەمەوە!

**که ژنەی سیحرباز گوێی لەم قسەیە بوو گوتی:**

- **بەڵام تۆ دەتوانی تەنیا قامکتم لە کونی دەرگاکەوە پێ نیشان بدەی!**

**لێ وەختێ بلور قامکی لە کونی دەرگاکەوە بردە دەرێ، ژنەی سیحرباز بە پەلە ئەڵقەیەکی جادویی لە قامکی کردو کیژێ بورایەوەو کەوتە سەر زەوی.**

**کاتێ شەو داهات‌و دێوەکان بۆ ماڵ گەڕانەوە، چەندیان لە دەرگادا، چ کەسێك دەرگای لێنەکردنەوە. بۆیە دەرگاکەیان شکاندو وەژوورکەوتن. کە دیتیان بلوری داماو لە ئەرزەکەدا کەوتووە، وایانزانی مردووە. بۆیە حەوت دێوە میهرەبانەکە بەوپەڕی خەم‌و پەژارەوە، بلوریان لە سەندوقێکی زیوین ناو فڕێیان دایە روبارەوە. بەڕێکەوت ئەم روبارە بەناو باخێکدا رەت دەبوو کە هی شازادەیەکی لاو بوو. رۆژێك شازادە لەناو باخەکەی‌و لە قەراخ رووبارەکە دانیشتبوو، لە پڕ بینی کە سەندوقێکی زیوین بەسەر ئاوەکەوەیە، خێرا دەستووری بە دەست‌و پێوەندان دا کە خێرا ئەو سەندووقەی سەر ئاوەکە بگرنەوەو بۆی بێنن.**

**وەختێ سەندووقەکەیان بۆ شازادە هێناو سەرەکەیان کردەوە... شازادە تەمەشای کرد کچێکی یەجگار جوان‌و نەشمیل لە ناویدا نووستووە. ئەمە جوانترین زیندەوەر بوو کە تا ئێستا دیتبووی. ئیدی شازادە کە تەواو ئاشقی بلور بوو بوو، یەکسەر دەستووری دا کە لە سەندووقەکە دەری بێنن‌و لەسەر تەختێك دای بنەن. کە چووە دیار کیژێ چاوی بە ئەڵقەیەکی سەیر کەوت کە لە قامکی بلوردا بوو، دەستی بردو ئەڵقەکەی لە قامکی بلور دەرهێنا، لە پڕ بلور بە هۆش هاتەوەو دانیشت. پاش ئەمە حاڵ‌و حیکایەتی خۆی بۆ شازادە گێڕایەوەو وەختێ شازادە بە حیکایەتەکەی زانی، دەستووریدا کە زڕخوشکە ناشیرینەکەی بلور، کە بە فێڵ و تەڵەکەبازی بوو بوو بە هاوسەری، بێنن‌و پێی گوت:**

- **حەز دەکەی چل دانە خەنجەرت بدەنێ یا چل قاتر!**

**کیژێ وەڵامی دایەوە:**

- **چل قاتر.**

**شازادە یەکسەر دەستووریدا کە بە کلکی ئەو چل قاترەوەی ببەستن‌و لەو کێوانە بەرەڵلای بکەن، تا بە سزای کارەکەی خۆی بگات. ئەوجا شازادە دەستووریدا کە ئاهەنگێکی بەشکۆ بۆ ماوەی چل شەوو چل رۆژ بگێڕن‌و پاشان لەگەڵ بلوردا زەماوەندی کرد.**

**حیکایەتەکەمان لێرەدا تەواو بوو، حیکایەتێکی خۆش بۆ ئەوان‌و سەلامەتی بۆ ئێمە هەمووومان.**

## ڕێوی و گۆزە

هەبوو نەبوو، لە زەمانی کۆندا ڕێوییەکی حیلەباز هەبوو. ڕۆژێ ئەم ڕێوییە چووە سەر جادەیەك و کەوتە هەڵبەزو دابەزو خۆ خلکردنەوە. لەو کاتانەدا کاروانێك دەرکەوت، کاروانچییەکان ماندوو و شەکەت و تینوو بوون. بیرێکی قوڵی پڕ ئاو لەو ناوە بوو. کاروانچییەکان لێبڕان بۆ سێ ڕۆژان لەوێندەر لابدەن و پشوویەك بدەن و ئیسراحەت بکەن. ڕێویەکە ماوەیەك لە کونەکەی خۆیدا مایەوە. پاشان بەو خەیاڵەی کە کاروانچییەکان ڕۆییشتوون، سەری لە کونەکەی هێنایە دەرێ. لەم کاتەدا گوێی لە دەنگی بنیادەمان بوو، و خێرا خۆی وە کونەکەیدا کردەوە. ڕێویەکە هەستیکرد کە ئەم کاروانچیانە نیازیان نییە بەم زووانە بڕۆن. بۆیە ناچار بوو تینوو برسی لە وێندەر بمێنێتەوە.

لە چوارەم ڕۆژدا کە ڕێبوارەکان دەیانویست بڕۆن، سەری گۆزەیەکیان شکا، گۆزەکەیان توڕدا، گۆزە خل بووەوەو گەییە بەر کونی ڕێوییەکە. شنەبا دەهات و خۆی بە ناو گۆزەکەدا دەکردو دەنگی دەدایەوە. دەنگێك هەر لە دەنگی ئاخاوتنی بنیادەمان دەچوو. ڕێویەکە هەمدیس ویستی لە کونەکەی وەدەربکەوێ، بەڵام دیسان هەمان دەنگی ژنەوت و لەبەر خۆیەوە گوتی: "وای ئەمڕۆ چوارەمین ڕۆژە. باشە ئەمانە بەنیازن کەنگێ بڕۆن؟"

لە هەمان شوێندا مایەوەو چاوەڕوانی کرد، لێ دەنگی گۆزەکە هەر نەبڕا. ڕێویەکە دیسان بەو خەیاڵەوە کە کاروانچییەکان هێشتا هەر سەرگەرمی قسەو باسی خۆیانن، لە کون نەهاتە دەرێ و نەهات، لێ ئاخیری تاقەتی چوو و لەبەر خۆوە گوتی: "چی دەبێ با ببێ، پێویستە لێرە وەدەربکەوم، چی دەقەومێ با بقەومێ، لەوە باشترە لێرە یا بگەنێم و بمرم".

ڕێویەکە لە کونەکەی دەرفرتاو پێی وەغارێوەنا، ئاوڕێکی ئەم لاو ئەولای دایەوە کەس لەوێندەر نەبوو. ئاوڕێکی پاشی دایەوەو گۆزەیەکی شکاوی بینی و پەی بە مەسەلەکە بردو هاتە دیار گۆزەکەو گوتی: "هەی ناڕەسەن! بۆ بوویتە بایسی ئەوەی کە چوار ڕۆژان بە برسێتی وەمێنم, ڕاوەستە با سکێ تێر بکەم و بگەڕێمەوە، ئەوسا خۆم دەزانم چ بەڵایەکت بەسەر دێنم!"

ڕێویەکە ملی ڕێی گرت و پاش ماوەیەك پارچە گۆشتێکی لە عاردیدا بینی, ویستی بیخوات کە گورگێك لە ڕێگەوە هات بەسەرداو گوتی: "ئەهای ڕێوی! بۆچی لێرە وەستاوی؟ زۆر سەرگەردان و پەشۆکاو دیاری".

ڕێویەکە تەمەشایەکی گورگەکەی کردو بە پەلە سەلامی کرد. گورگەکە گوتی: "بەخت فریات کەوت، ئەگەر سەلامت نەکردبایە، پارچە پارچەم دەکردیت!".

ڕێویەکە کە زۆر ترسا بوو، لەرزی و گوتی: "سەروەری جەنابی گورگ، لێ لە بری من پارچە پارچە بکەی و بمخۆی، باشتر وایە ئەم پارچە گۆشتە بخۆی" و پارچە گۆشتەکەی بە

گورگەکە نیشاندا. گورگەکە بەسەرسامی گوتی: "چ عەجەب کەتۆ ئەم گۆشتە ئامادەیەت نەخوارد؟"

ڕێویەکە گوتی: "ئاخر دەمزانی درەنگ یان زوو پەیدا دەبیت، بۆیە بۆ تۆم دانا بوو"

گورگەکە پرسی: "ئاخۆ ئەم گۆشتە شیرینە؟"

ڕێویەکە گوتی: "هەڵبەتە شیرینە! چما گۆشتی تاڵیش هەیە؟ ئەگەر ئەم گۆشتە بە نسیبی من بوو بووایە دەمکرد بە یەك پاروو"

– ئاوها! جا مادامێکی ئەم گۆشتەت بۆ من داناوە، منیش تۆ بیٚ بەش ناکەمو بەشی خۆتت دەدەمیٚ".

و بەرەو لای گۆشتەکە چوو، ویستی گۆشتەکە هەڵگریٚ کە پێی بو بە تەڵەوەو ئازارێکی وەهای پیٚ گەیی خۆی پیٚ نەگیراو پڕ بەزار هاواری کردو خۆی بەم لاو بەولادا کوتاو تەپو تۆزی هەستاند.

ڕێوییەکە گوتی: "ئەی گورگی چاوچنۆك! گومانم لە هێزو توانات نییە، بەڵام دەربارەی چاوەکانت چ بڵێم؟ لەگەڵ چاوی کوێردا فەرقیان نییە".

و بەخۆی گۆشتەکەی هەڵگرتو خواردی. گورگە بەدەم پاڕانەوەوە گوتی: "ڕێوی گیان! من خەریکە دەمرم. وەرە ڕەحمیٚ بە حاڵی من بکەو نەجاتم بدە".

و پێی ڕاتەکاند. ڕێویەکە هاتە لای گورگەکەوەو گوتی: "بە خۆڕایی ئەزیەت مەکێشە. هەرگیز ناتوانی لە تەڵەکە ڕزگار ببی. چاوەکانت سوور سوور بوون، چاکتر وایە چاوەکانت بنوقێنیو بنووی!"

ڕێویەکە گەڕایەوەو هاتە لای گۆزەکە. لێبڕا گۆزەکە لە ئاودا غەرق بکاتو تۆڵەی خۆی بستێنیٚ. گۆلاوێکی نزیك لەو ناوە بوو. ڕێویەکە توند گۆزەکەی بە کلکی خۆیەوە بەستو بە دووی خۆیدا ڕایکێشاو خستییە ئاوەکەوە. ئاو چووە گۆزەکەوە. دەنگی ئاو بەرز بووەوە. ڕێویەکە گوتی: "بێدەنگ بە، بە مەرگی خۆت پێدەکەنی؟!".

بەڵام دەنگی ئاوو گۆزەکە کەم نەدەبوو. تا زیاتر ئاو دەچووە گۆزەکەوە، دەنگی بەرزتر دەبوو.

ڕێویەکە گوتی: "بێدەنگ بە! ئێستا کە گاڵتە دەکەی، بێگومان بە هەر نقومت دەکەم..."

گۆزەکە تا زیاتر دەچووە ناو ئاوەکە، زیاتر کلکی ڕێوییەکەی ڕادەکێشاو نزیك بوو ڕێوییەکەش لە ئاوەکەدا غەرق ببیٚ. گۆزەکە قورسو قورس تر دەبوو و ڕێوییەکەی توندتر ڕادەکێشا.

ڕێوییەکە لە پڕ بینی کە خەریکە خۆیشی غەرق دەبیٚو هاواری کرد: "ئای، دۆستی ئازیز، کلکم بەر بدە. من هەڵەم کرد. تکا دەکەم بەرم بدە".

ڕێوییەکە چەندی دەپاڕایەوەو دەلالایەوە، فایدەی نەبوو. گۆزەکە پتر دەچووە خواریٚو ڕێوییەکەی لەگەڵ خۆیدا بکێش دەکرد، ڕێوییەکە هاواری کرد: "وای، خەریکە دەمرم"

و کەوتە لەقەفرتێ تا خۆی رزگار بکات. رێك لەو کاتەدا پێستی کلکی داماڵاو بە کلکی رووتو سوورەوە لە ئاوەکە دەرفرتایە دەرێو پێی وەغارێوەنا. گورگەکە تازە لە تەڵە رزگار بوو بوو، بە دەم لەنگیینەوە دەهات، هەر کە رێوییەکەی بینی، بەردەمی گرتو گوتی: "هەی رێوی ناڕەسەن! بەگیرم هێنای".

رێوییەکە بەترسەوە گوتی: "گورگی ئازیز! چی بووە؟ مەگەر خەتایەکم کردووە؟"

گورگە لە توڕەییدا خەریك بوو گڕ بگرێت.

– هەی ناڕەسەن! تۆ منت خستە تەڵەوەو لاقت بریندار کردم، دەبێ تۆڵەت لێ بکەمەوە.

رێوییەکە گوتی: "سەبرێ بکە، من نازانم مەسەلە چییە، تۆ باسی چی دەکەی؟ بێگومان لێت تێکچووەو من بە رێوییەکی دی دەزانی. جەنابی گورگ! ئەو ناڕەسەنەی کە ئەزیەتی داویت لە کام دەستە رێوییان بوو؟ لە تاقمی کلك سوری لاوازان بوو یان لە تاقمی کلك توکنەکان بوو؟ ئاخر ئێمەی رێوی دوو جۆرین"

گورگە گوتی: "وا بزانم کلکی توکن بوو"

رێوی گوتی: "کەواتە ئەو رێویەی تۆ لێی دەگەڕێی من نیم. من لە تاقمی کلك سوورەکانم, ئەگەر باوەڕ ناکەی، بێ سەیری کلکم بکە".

کلکە سوورو داماڵراوەکەی نیشانی گورگەکەداو جارێکی دیکە گورگەی هەڵخەڵەتاندو ملی رێگەی گرتو رۆیی.

## به خەیاڵی راو

هـەبوو نـەبوو، رێوییـەك هـەبوو کـە گـەیی بـووە تەمـەنی پـیریو ئیـدی راوکردنـی بـەلاوە زەحمەت بوو. ئەم رێوییە رۆژێ لە رۆژان تووشی شێرێك بوو. شێرەکە پرسـی: "رێـوی گیـان بۆ ئەوەندە لاواز بووی؟"

رێـوی گـوتی: "دۆسـتی ئـازیز! چـۆن لاواز نـەبم؟ دەمـەوێ گیانلەبـەرانی گـەورە راو بکـەم، دەرەقـەتی نایـەم، گیانلەبـەرانی بچووکیش زوو هەڵدێنو لـە دەسـتم دەردەچـن، تـەنیا مشـکە کوێرەم بۆ دەمێنێتەوە. ئـەویش دڵـم نایبـاتو پـێم ناخورێـت. کـە لـە ناچاریشـدا دەیخـۆم دڵـم تێك هەڵدێت. نازانی رۆژگارم چەند بە ناڕەحەتی دەگوزەرێت.

شێرەکە دڵی بە حاڵی رێوییەکە سووتاو گوتی: "ئا، خەم مەخۆ، من گیانلەبەرێکی باشـت بۆ راو دەکەم تا بە ئارەزووی خۆت بیخۆیو قەڵەو ببی".

شـێرو رێـوی کەوتنـە رێ. دوای ماوەیـەك چـاویان بـە چـەند بارگیرێـك کـەوت، بـە جووتـە خۆیان لە بۆسەنا, بارگیرەکان گەیینە نزیکییان. شێرەکە بەغرورەوە پرسی: "مووەکانی یـاڵم رەق بوون؟!"

رێوی گوتی: "بەڵێ، وەکو شیش راوەستاون".

شێر پرسی: "چاوانم سور سور بوون؟"

رێوی وەڵامی دایەوە: "بەڵێ سوری سور بوون"

شێر پرسی: "قژم رەپ بووە؟"

– بەڵێ رەپ راوەستاون.

– کەواتە حەساوی یەکێك لەو بارگیرانە رۆیی.

لەگـەڵ ئـەم قسـەیەدا شـێرەکە پـەلاماری بارگیرەکـانی داو یـەکێکیانی گـرتو کوشـتی. هەوەڵجار بەخۆی تێری لە گۆشتی بارگیرەکە خواردو هەندێکیشی هەڵگرتو ئەوی تری دا بە رێوییەکە. گۆشتی بارگیرەکە بەشی یەك مانگی رێوییەکەی کرد. رێـوی یـەك مـانگی تـەواو خواردیو خەوتو هێزی وەبەر هاتەوەو قەڵەو بوو.

رێوی رۆژێك دۆستە کۆنەکانی خۆی بینی، زۆریان پێ سەیر بوو کە وا بوژاوەتەوەو قەڵەو بووە.

رێو گوتی: "من بووم بە دۆستی شێرو لەوەوە فێری راو بووم. ئەگەر حەز دەکەن ئێـوەش فێرە راو دەکەم!"

رێوییەکانی دی گوتیان: "بە راستتە؟ ئەگەر فێرمان بکەی زۆر خۆشحاڵ دەبین"

رێوی گوتی: "باشە، با بڕۆین"

خۆی پێش کەوت و ئەوانی دیش بە دوویدا، پاش ماوەیەك چاویان بە بارگیرێك کەوت. ڕێوی داوای لە دۆستەکانی کرد کە خۆ لە بۆسە بنەن، هەموو خۆیان حەشاردا، بارگیرەکە گەییە نزیکیان.

ڕێوی هەمان ئەو پرسیارانەی بیرکەوتنەوە کە کاتی خۆی شێرەکە کردبوونی و لە هاوڕێکانی پرسی: "مووەکانی یاڵم ڕەق بوون؟ چاوانم سوور سوور بوون؟ قژم ڕەپ بووە....؟"

لەو کاتەدا بارگیرەکە گەیی بووە چەند هەنگاوی ئەوان. ڕێوییەکە هێرشی بۆ برد، کە گەییە دوای بارگیرەکە، بارگیرەکە لەقەیەکی ئەوتۆی بە تەختی تەوێڵیدا کێشا کە لەسەر زەوی تەخت بوو و ئیدی هەڵنەستایەوە. ڕێوەییەکان کە ئەم دیمەنەیان بینی، پێیان وەغارێوە ناو ڕۆییشتن.

## سەری گورگ

هەبوو نەبوو، لە زەمانی کۆندا پیاوێك هەبوو بزنێكو مەڕێکی هەبوو. پیاوە پەتی ملیانی بە درەختێکەوە دەبەستو ئاگاداریانی دەکرد. رۆژێ بزنە ژنەوتی کە خاوەنەکەیان دەیەوێ بیکاتە قوربانی، بۆیە هاتە لای مەڕەو گوتی: "دۆستی ئازیز! بیستوومە کە خاوەنەکەمان دەیەوێ هەردووکمان بکاتە قوربانی. وەرە با رابکەین".

مەڕە گوتی: "ئاوها، کەواتە نابێ بۆ تاقە ساتێك لێرە بمێنین"

هەردووکیان هێزیان وەبەرخۆداو هێندەیان پەتە راکێشا تا پچڕا. لە هەمان ساتدا شاخی بزنە چوو بەو تورەکەیەدا کە خاوەنەکەیان خواردنی بۆ تێدەکردن. بزنە بە تورەکەکەوە کەوتە رێ، مەڕەش دوای کەوت.

ماوەیەك بەدەشتو دەردا رێیان کرد تا چاویان بەسەری گورگێ کەوت کە لەو گۆڕە کەوتبوو. بزنەکە ترسابوو بە مەڕەی گوت: "مەڕە گیان ئەو سەرە دەبینی؟ سەری دژمنی تۆیە، دەزانم تۆ زۆر دلاوەرو ئازای، بڕۆ ئەو سەرە هەڵگرەو بیخە تورەکەکەوە، بێگومان وەختێ دەبێ بە کەڵکمان دێ!"و خۆی لە جێی خۆی وەستاو جوڵەی نەکرد.

مەڕە گوتی: "ئەی بزنی ئازیز! هەرچییەك بێ تۆ ریش سپیت. دەزانم کە لە من ئازاتری. چاکتر وایە خۆت برۆیت و بیخەیتە تورەکەوە. "

بزنە گوتی: "کەواتە وەرە با هەر یەکەمان سەرێکی تورکەکە بگرینو بڕۆینو پێکەوە سەری گورگەکە هەڵگرینو لە تورەکەکەی بنەین"

مەڕە قاییل بوو. بە دوو قۆڵی سەرە گورگەکەیان هەڵگرتو لە تورکەکەیان ناو کەوتنە رێ. دوای ماوەیەك گردێکیان هاتە پێش، سەرکەوتنە سەر گردەکەو تەمەشای دەوروبەریان کرد. لە شوێنێکی دوور ئاگرێکیان بەدی کرد کە دوکەڵی چوو بوو بە ئاسمانا. رووەو ئاگرەکە وەڕێ کەوتن، کە نزیکی ئاگرەکە بوونەوە، بینیان کە حەوت گورگ لە دەوری ئاگرەکەنو پڵاو لێدەنێن. گورگەکان ئەو جووتەیان بینی. ئیدی کار لە کار ترازا بوو، و مەڕەو بزنە رێگەی هەڵاتنیان نەما. بۆیە زۆر بە ساردی سڵاویان لە گورگەکان کرد. گورگەکان گوتیان: "عەلیکە سەلام، باش بوو کە گۆشتیش بۆ پڵاوەکەمان پەیدا بوو".

پێکەنینو شادمانو خۆشحاڵ هەستانە سەرپێ. بزنە روو لە گورگەکان گوتی: "دۆستان هیچ خەمتان نەبێ، تا حەز بکەن گۆشتمان هەیە! ئێوە ئەو زەحمەتە بکێشنو زووتر خواردنەکە بکوڵێنن."

گورگەکان پرسیان: "کوا" گۆشتەکەتان لە کوێیە؟"

بزنە رووی لە مەڕە کردو گوتی: "مەڕە گیان! بڕۆ یەکێك لەو سەرە گورگانە لەناو تورکەکەمان دەربێنە, بیهێنە تا زووتر بیخەنە ناو پڵاوەکەوە تا بکوڵێ".

مەڕە زوو ڕۆیی و سەرە گورگەکەی هەڵگرت و هێنای. بزنە گوتی: "لە ناو نۆ سەرە گورگدا، ئەم وردەیەت هێنا؟ بڕۆ گەورەترینیان بێنە، ئەدی نابینی نۆ نەفەرین؟"

گورگەکان زۆر ترسان و کەوتنە چپەچپ: "وای! ئەمانە لە ئێمە خوێنخۆرترن! ئەگەر ماتەڵ ببین، سەری ئێمەش هەڵدەکەنن."

لە پڕ هەستان و هەڵاتن. بزن و مەڕەش پڵاوەکەیان خواردو بە کەماڵی ئیسراحەت لێی ڕاکشان.

## چۆلەکەی زانا

هەبوو نەبوو، چۆلەکەیەکی جوان هەبوو لە بیابانێکدا دەژیا. رۆژێ ئەم چۆلەکەیە کەوتە داوی کابرایەکی راوچییەوە. چۆلەکە رووی کردە راوچی و گوتی: – ئەی پیاوی راوچی! من مەکوژە، لە جیاتی ئەوە سێ پەندی گرینگت فێر دەکەم، کە هەمیشە بە کەڵکت دێن.

راوچی تۆزێ بیری کردەوەو پاشان گوتی: –باشە کەواتە جارێ سێ پەندەکەم پێ بڵێ تا منیش ئازادت بکەم و کوێت دەوێ برۆ. چۆلەکەکە گوتی:

- یەکەم ئەوەیە، هەرگیز خەفەت بۆ چووان مەخۆ.
- دووەم باوەڕ بە شتێك مەکە کە لە ئەقڵ بەدوورە.
- سێیەمیان ئەو وەختە پێت دەڵێم کە بەرەڵلات کردم.

راوچی چۆلەکەکەی لە تۆڕ دەرهێناو چۆلەکەکە فڕی و لەسەر درەختێك نیشتەوەو گوتی:
– ئەی راوچی تۆ هەڵخەڵەتای، من نزیکەی دوو مست جەواهیرم لە سکدایە، هەرگیز دەستت بەو جەواهیرانە ناگات!

راوچی لەوە ژێوان بووەوە کە چۆلەکەکەی ئازاد کردبوو. چۆلەکەکە هەستی بە پەشیمانی کابرای راوچی کردو گوتی:

- ئەی راوچی گەوج، مەگەر من پێم نەگووتی خەفەت بۆ چووان مەخۆ! چ زوو لە بیرت کردو پەشیمان بوویتەوە! ئەگەر گەوج نەبووایەی باوەڕت بە قسەی من نەدەکرد. ئاخر جەواهێر لە سکی مندا چ دەکات؟ تۆ ناتوانی هێلکەیەکی بچووك لە سکی مندا پەیدا بکەی چ جای جەواهێر.

چۆلەکەکە ئەو قسەیەی کردو ئەوجا لە شەقەی باڵی داو بەسەر چیاو دۆڵاندا رۆیی.

## بسته بالاو سەگەکەی

هەبوو نەبوو، لە زەمانی کۆندا پیرەمێردێك هەبوو سێ کوڕی هەبوو. بچووکترین کوڕیان بالای بستێك‌و ردێنی دوو بست بوو. پیرەمێردە پارەی بە قەرز دابووە دێوێك. چەندین مانگ بوری بوو، بەڵام دێوەکە قەرزەکەی نەدەدایەوە.

رۆژێ لە رۆژان کوڕە گەورە وەڕێ کەوت تا قەرزەکەی بابی لە دێوە بسەنێتەوە. کاتێ کوڕە گەورە گەییە لای دێوە، دێوە ناسییەوەو گرتی‌و فڕێی دایە ناو بیرێکەوە.

چەند رۆژێك بوری‌و کوڕە گەورە نەهاتەوە. باوك‌و براکانی هەستیان کرد کە دێوە بەڵایەکی بەسەردا هێناوە. کوڕی دووەم گوتی: "باوکە! من دەڕۆم، هەم قەرزەکەمان وەردەگرمەوەو هەم براکەم نەجات دەدەم".

کەوتە رێ‌و چوو بۆ لای دێوە، هەر کە کوڕی دووەمیش گەییە لای دێوە، دێوە گرتی‌و خستییە بیرەوە. باوك‌و کوڕە بچووك چەند چاوەڕوانیان کرد ئەو دوو کوڕە هەر نەگەڕانەوە.

تا (بستە بالا) بڕیاریدا بە دوایاندا بڕوات. بابی گوتی: "براکانت کە خەڵکی تەواو بوون، نەیان توانی باری دێوە ببەن، ئێستا تۆ بە بستێ بالاوە چیت پێ دەکرێت؟ چاکتر وایە لەماڵەوە دانیشیت‌و خۆت تووشی چەرمەسەری نەکەیت".

بستە بالاو گوتی: "باوکە! ئەم بیانوانە بۆ من مەیەنەوە. من دەرەقەتی دێوە دێم، رێمکە با بڕۆم".

باوکەکە گوتی: "کە سووری لەسەر رۆییشتن چ قسەیەکم نییە. ئەگەر حەز دەکەی، بڕۆ کوڕەکەم! لێ ئاگات لە خۆت بێ".

بستە بالای دوو بستە ریش کەوتە رێ. سەگەکەشی لەگەڵ خۆیدا برد. لە رێگە چەقەڵێك هاتە سەر رێیان. بستە بالا بە سەگەکەی گوت: "سەگەکەم غاردە غاردە ئەو چەقەڵە قووت بدە!"

سەگە چووە پێشی‌و چەقەڵەکەی بە ساغی قووتدا. دیسان ملی رێیان گرت‌و رۆییشتن. ئەمجارەیان تووشی گورگێك بوون. بستە بالا بە سەگەکەی گوت: "ئەی سەگەکەم هەڕاکە ئەو گورگە بگرەو قووتی بدە!".

سەگە, گورگەکەشی وەکو چەقەڵەکە بە زندوویەتی قووتدا. دیسان وەڕێ کەوتن‌و گەیینە قەراخی دەریایەك. بستە بالا بە سەگەکەی گوت: "سەگەکەم غاردە غاردە ئەم دەریایە بخۆرەوە!"

سەگەکە لە چاو تروکانێکدا ئاوی دەریاکەی خواردەوە، رۆییشتن تا گەیینە بەر ماڵی دێوە. بستە بالا بە توندی لە دەرگایدا. دێوە دەرگای کردەوەو بینی کە لە خوارەوە مرۆڤێکی بستە بالا راوەستاوە. بستە بالا سەری هەڵبڕی و گوتی: "ئەی دێوی ناڕەسەن! خێرا براکانم

و قەرزەکەی بابم بێنەو بیاندە بە من، ئەگینا هەرچییەکت بەسەر بێ ئوباڵت لە گەردنی خۆتە!"

دێوەکە بێ ئەوەی قسەیەك بکات، هەڵی گرتو بردیو خستییە ناو کولانەی مریشکە برسییەکانەوە، تا بە دەنووك بستە باڵا بکوژن. سەگەکەش کە ئەوی بینی خۆی بە کولانەکەدا کرد.

بستە باڵا بە سەگەکەی گوت: "سەگەکەم وەختی هاتووە، چەقەڵەکە بێنە دەرەوە".

سەگە، چەقەڵەکەی لە دەمییەوە هێنایەوە، چەقەڵ بە پەلە هەموو مریشکەکانی ناو کولانەکەی خواردو هەڵاتو رۆیی.

رۆژی دوایی دێوە هاتو شوێنەواری مریشکەکانی نەبینی. رۆی کردە بستە باڵاو نەڕاندیو گوتی: "دەتخەمە بەر بزنو مەڕەکان تا ئەوەندەت قۆچ لێ بدەن کە بتکوژن".

و بستە باڵای گرتو بردیو تورِی دایە گەوڕەکەوە.

سەگەکەش لەگەڵیا چووە گەوڕەکەوە. بستە باڵا بە سەگەکەی گوت: "سەگەکەم، بانگی بکە، ئەو گورگە بەرەڵڵا بکە"

سەگەکە خێرا ئەو گورگەی، کە قووتی دابوو, هێنایەوە, گورگە مەڕو بزنەکانی خوارد، دەرگای گەوڕەکەی کردەوەو رۆیی.

دوای ماوەیەك، دیسان دێوەکە هاتو چ مەڕو بزنێکی نەبینی. تورِە بوو و گوتی: "کەوایە، مەجبورم خۆم بتخۆم".

و هات بۆ لای بستە باڵا، بستە باڵا دەرگای گەوڕەکەی کردەوەو بازی دایە دەرێو چووە سەربانیماڵەکەی دێوەو رووی کردە سەگەکەیو هاواری کرد: "ئەی سەگەکەم خێرا دەریاکە برێژە دەرێ".

سەگەکە زاری کردەوەو هەموو ئاوەکەی هەڵهێنایەوە. دێوەو ماڵو موڵکەکەی کەوتنە ژێر ئاوەوە. دێوە لە خنکانا بوو کە بە دەنگی لەرزۆك وەڵامی دایەوە: "ئەی بستە باڵا! من سوعبەتم لەگەڵ کردی! لەو سەندوقەدا چەندت بوێ گەنجو زێڕ هەیە، بڕۆو هەڵگرە، بەڵام نەجاتم بدە"

بستە باڵا گوێی بە دێوە نەدا، دێوە غەرق بوو. بستە باڵا بە سەگەکەی گوت: "ئەی سەگەکەم خێرا غاردە زێڕەکان قووت بدە".

سەگە، سەندوقەکەی کردەوەو هەموو گەنجەکانی قووتدا. بستە باڵا چووە پێشێو براکانی لە بیر دەرهێنانو لەگەڵ ئەوانو سەگەکەیدا بۆ ماڵی خۆیان گەڕانەوەو بە سەگەکەی گوت:

"سەگی چاكو ئەمەکدار گەنجەکان هەڵبێنەوە".

سەگە، هەموو گەنجو زێڕەکانی دەرهێنانەوە، پیرە باب بە دیتنی ئەوان خۆشحاڵ بوو، لەوە بەدواوە بابو کوڕەکانی بە ئاسوودەیی ژیان.

# بێ ئەقڵ و ئاقڵ و قەلەڕەش

هەبوو نەبوو. لە گوندێکدا پیرەژنێك هەبوو کە دوو کوڕی هەبوو. گەورەکەیان بێ ئەقڵ و چکۆڵەکەیان ئاقڵ بوو.

دایکە پیرەکەیان مرد. جووتە برا میراتی دایکیان بەش کرد. بێ ئەقڵە مانگایەکی پێ بڕاو ئاقڵەش قەلەڕەشێك. بێ ئەقڵ نەیتوانی مانگاکەی بەخێو بکات بۆیە لێبڕا بیباتە بازێڕو بیفرۆشێت. لە ڕێگە تووشی قەلەڕەشێك بوو. قەلەکە بێ ئەقڵەی بینی و قڕاندی. بێ ئەقڵ گوتی: "چ دەڵێی؟ دەتەوێ مانگاکەم بکڕی؟!"

قەلە ڕەشەکە دیسان قڕاندی: "قخ قخ...."

بێ ئەقڵە گوتی: "وتت دەیکڕم؟"

قەلە دیسان قڕاندی. بێ ئەقڵە گوتی: "بە چەند دەیکڕیت؟"

قەلەکە هاواری کرد: "قخ... قخ..."

بێ ئەقڵە گوتی: "بەسەد تومەن دەیکڕیت؟"

- قخ... قخ....
- ئێ. زۆر باشە ئێستا مانگاکەت لە شوێنێکدا بۆ دەبەستمەوەو سبەینێ دێمەوە بۆ پارەکەی!

پەتی ملی مانگاکەی بە درەختێکەوە بەست و ڕێ و ڕێ بۆ ماڵ گەڕایەوە. ئاقڵە کە چاوی پێی کەوت گوتی: "مانگاکەت فرۆشت؟"

کەللە پوچ (بێ ئەقڵە) گوتی: "بەڵێ فرۆشتم".

- بە چەند تومەن؟
- بە سەد تومەنم فرۆشت.
- بە کێت فرۆشت؟
- بە قەلە ڕەشم فرۆشت. سبەی دەچم پارەکەی وەردەگرم.
- چما قەلە ڕەشیش مانگا دەکرێت؟ قەل پارە لە کوێ بێنێ؟

خێرا بڕۆ مانگاکەت بێنەوە! ئەمە چ کارێکت کردووە؟

بێ ئەقڵە هیچ ناڕەحەت نەبوو. ئەو شەوە بەخەیاڵی ئاسودە نووست و بەیانی زوو لە خەو رابوو و بە دەم هاواری: "لە کوێی قەلێ"وە کەوتە ڕێ.

گەییە ئەو شوێنەی مانگاکەی لێ بەستبووەوەو بینی مانگاکە پارچە پارچە کراوەو لەو گۆڕە کەوتووە قەلەکەش سەرگەرمی خواردنی گۆشتی مانگاکە بوو. بێ ئەقڵە چووە لای قەلەکەو گوتی: "پارەی مانگاکەم وێدە!"

قەلەکە دیسان قڕاندی. بێ ئەقڵ گوتی: "چی؟ نایدەی؟ کە گۆشتەکە دەخۆی شیرینە بەلام کە پارەکەی بدەی تاڵە؟! ئێستا پێت نیشان دەدەم"

بەردێکی هەڵگرت و خێواندییە قەلە. بەردەکە بەر قەلە نەکەوت و یەکڕاست ڕۆیی و بەر کەلاوەیەکی ئەو لای قەلەکەوە کەوت. دیوارەکە ڕوخا. بێ ئەقڵە گوتی: "خۆ بینیت؟ دیواری ماڵەکەتم ڕوخاند. ئەگەر پارەکەم نەدەی خۆیشت دەکوژم. ڕاوەستە بزانم شتێك لە ماڵەکەتدا پەیدا نابێ؟"

بەرەو کەلاوەکە ڕۆیی. لەپڕ چاوی بە گۆزەیەکی پڕ لە زێڕ کەوت کە سەری بە دەرەوە بوو. بێ ئەقڵە دەستی بە گۆزەکەدا کردو بە ئەندازەی سەد تومان زێڕی لێی دەرهێنا. زەڕەیەك زیاتر لە هەقی خۆی دەرنەهێنا. پاشان بەرەو ماڵ گەڕایەوەو چووە لای براکەی و گوتی: "پارەکەم لە قەلەڕەش وەرگرت. قەلێکی زۆر دەوڵەمەند بوو. یەك کوپەڵە (گۆزە) زێڕی هەبوو. هێندە لە زێڕەکانی بێ خەم و بێ موبالات بوو کاتێ کە لێم هەڵگرتن، هەر ئاوڕیشی نەدایەوە. منیش بە دەستەکانی خۆم بە ئەندازەو بایی سەد تومەن زێڕم هەڵگرت و گەڕامەوە".

ئاقڵە گوتی: "ڕاست دەکەی؟ وەرە با بڕۆین ئەو گۆزەیەم پێ نیشان بدە"

بێ ئەقڵە براکەی بردو کەلاوەکەی پێ نیشاندا. ئاقڵە ئەوێندەری هەڵگێڕایەوەو گۆزەکانی دیتەوە. پاشان گۆزەکانی بە خۆڵ داپۆشی و بۆ ماڵ گەڕانەوە تا شەوێ دووبارە بگەڕێنەوەو کەس پێیان نەحەسێت. شەو هات و ئاقڵە کیسەیەکی پڕ لە نۆك و مێوژی هەڵگرت و بێ ئەقڵەی گاز کردو بە دوو قۆڵی بە سواری ولاغ بەرەو کەلاوەکە وەڕێ کەوتن.

دوای ماوەیەك گەییشتنە ئەوێندەرو گۆزەکانیان لە ولاغ بارکرد. لە ڕێگەدا ئاقڵە جار جار نۆك و مێوژی بەسەر سەری بێ ئەقڵەدا هەڵدەدا. بێ ئەقڵە بێ ئەوەی ئاگای لەم کارەی براکەی بێ دەیگوت: "ئەوە چییە، خۆ نۆك و مێوژم بەسەردا دەبارێ"

ئاقڵە گوتی: "ئەمشەو نۆك و مێوژ لە ئاسمانەوە دەبارێ. منیش دەی بینم. هەرچییەکت بەر دەست کەوت بیخۆو هەقت نەبێ.

گۆزەکانیان هێنایەوە ماڵێ. لە ناو ژوورەکەیان لە چاڵیان نان. ڕۆژێك ئاقڵ و بێ ئەقڵ بوو بە شەڕیان. بێ ئەقڵ جەنەی بەست و چوو سەربوری زێڕەکانی بۆ پاشا گێڕایەوە.

پاشا پرسی: "کەی دۆزیتانەوە؟"

بێ ئەقڵ گوتی: "ئەو شەوەی کە نۆك و مێوژ دەباری!"

پاشا گوتی: "ئەمە شێتە، خێرا لە کۆشك وەدەری نەن"

بێ ئەقڵەیان وەدەرنا. شەوێ، بێ ئەقڵە نارەحەت و توورە بۆ ماڵ گەڕایەوە. خەوی لێنەکەوت. نیوەشەو هەستاو کێردێکی هەڵگرت و بۆ کۆشکی پاشا ڕۆیی و گوتی: "تۆ بەیانی منت بە زۆر لە کۆشکەکەت وەدەرنا، ئێستا وەرە بزانم چیت لە دەست دێ."

پاشای کوشت و سەری بڕی و لە چاڵی نا. ڕۆژی دوایی هەواڵی کوشتنی پاشا لە هەموو لایەك بڵاو بووەوەو ماموران جاڕیاندا کە هەر کەسێك سەری پاشا بدۆزێتەوە، ئەو دەکەن بە پاشا...

بێ ئەقڵ ئەم هەواڵەی ژنەفت و چوو بۆ دەربارو گوتی:

"من پاشام کوشتووە"

- ئەدی کوا سەری؟
- با بڕۆین نیشانتانی بدەم, لە چاڵم ناوە.

ئاقڵە زوو پەی بە رووداوەکە بردو زانی بێ ئەقڵە چووە بۆ کۆشك, بۆیە سەری پاشای لە چاڵ دەرهێناو سەری بزنێکی لە جێی دانا. بێ ئەقڵ لەگەڵ دەربارییاندا هاتنە سەر چاڵەکەو چووە ناو چاڵە تاریکەکەوەو سەری بزنەکەی دەرهێناو لە ناو چاڵەکەوە هاواری کرد: "ئەهای! ئەرێ پاشاکەی ئێوە دوو شاخیشی هەبوو؟"

دەربارییان بەسەرسامییەوە گوتیان: "چی...؟"

بێ ئەقڵە دیسان لە خوارەوە هاواری کرد: "گوێچکەکانی پاشا زۆر گەورە بوون؟"

دەربارییان گوتیان: "تۆ سەرەکە بێنە دەرێ، ئەگەر بیدینین دەیناسینەوە"

- پاشا توکن بوو؟

دەربارییان تووڕە بوونو بێ ئەقڵەیان لە چاڵەکە هێنایە دەرێو سەری بزنێکیان بە دەستییەوە بینی. دەربارییان بە تووڕەیی هاوارییان بەسەر بێ ئەقڵەدا کردو هەڕەشەی کوشتنیان لێکرد. رێك لەم کاتەدا ئاقڵە هات بەسەراو پێی گوتن: "ئەمە شێتە، گوێ بە قسەکانی مەدەن"

دەربارییان بێ ئەقڵەیان بەرەڵلا کردو رۆییشتن. ئاقڵەو بێ ئەقڵ چوونەوە بۆ ماڵی خۆیانو لەوە بە دواوە بە خەیاڵی ئاسودەوە سودیان لە زێڕە گرانبەهاکانیان بینی.

## چەقەڵو لەق لەق

هەبوو نەبوو، لەق لەقێ هەبوو، رۆژێ لە رۆژان لەسەر دارێكی بەرز هێلانەی كردو هێلكەی كرد تا هەڵیان بێنێو ببێ بە خودان بێچوو لە تەنیایی رزگار بێ.

چەقەڵێك هێلكەكانی لەق لەقی بینی و چووە پێشێو گوتی: "ئەهای لەق لەق، خێرا یەكێك لە هێلكەكانت بخەرە خوارێ، ئەگینا دەتخۆم!"

لەق لەقی دڵساف نەیدەزانی كە چەقەڵ ناتوانێ بە درەختدا سەر بكەوێ، بۆیە ترساو یەكێك لە هێلكەكانی بۆ چەقەڵەكە خستە خوارێ. چەقەڵە زاری كردەوەو هێلكە لەق لەقەكەی گرتەوەو قووتی دا.

رۆژیی دوایی، چەقەڵ دیسان هاتەوەو هاواری كرد: "ئەهای لەق لەق، هێلكەیەكی دیكە لە هێلكە بەلەزەتەكانت بخەرە خوارێ، دەنا خۆت دەخۆم".

لەق لەق بە ترس و لەرزەوە، هێلكەیەكی دیكەی خستە خوارێو چەقەڵ ئەمجارەش خواردنێكی بە لەزەتی خوارد.

چەقەڵ لەو رۆژە بە دواوە هەموو رۆژێك دەهات و بە زۆر هێلكەی لە لەق لەقەكە دەسەندو دەیخوارد، لەق لەق لە دەستی چەقەڵە هەراسان بوو، چونكە نەیدەتوانی جوجەڵەیەك هەڵبێنێو دەبووایە بە تەنێ بژی. لەق لەق زۆر گریاو نزیك بوو چاوانی كوێر بن.

رۆژێ لە رۆژان قەلێكی بچوك بەسەر هێلانەی لەق لەقدا تێپەڕی و بینی لەق لەقەكە هۆن هۆن دەگرێ. قەلە لە لەق لەقەی چووە پێشەوەو گوتی: "ئەهای لەق لەقی ئازیز بۆچی دەگریت؟"

لەق لەق دەردی دڵی بۆ هەڵڕشت و هەموو شتێكی بۆ گێڕایەوە.

قەلەكە كاتێ گوێی لە قسەكانی بوو، پێكەنی و گوتی:

"ئەی لەق لەقی دڵساف!

ئەم بەرو ئەوبەر دەكەی

بە هێلكەی خۆت

چەقەڵ بە خێوی دەكەی

دڵی خۆت دەبرژێنی

ماڵی خۆت وێران دەكەی"

لەق لەقە گوتی: "ئەدی چ بكەم؟"

قەلێ جوابی دایەوە: "چاری ئاسانە. كە چەقەڵ هات پێی بڵێ ژەهر بخۆ! چما چەقەڵیش دەتوانێ بە داراندا سەر بكەوێ؟"

لەق لەق كە ئەم قسەیەی ژنەوت زۆر خۆشحاڵ بوو و گوتی: "ئاوها! تۆ تەماشا چۆن هەڵخەڵەتا بووم. ئەم كەڕەتە بێ جەوابی دەكەم".

قەلەکە گوتی: "ئەی لەق لەق! ئەگەر چەقەڵ لێی پرسیت کێ ئەمەی فێر کردیت، بڵێ خودانی ئەو چوار باخەی کە لە کەناری چوار سەرچاوەیە. قەلە چکۆل فێری کردووم".

قەلە،پاش ئەم قسانە لە شەقەی باڵی داو رۆیی. پاش ماوەیەك چەقەڵەکە پەیدا بووەوە. چەقەڵە وەکو هەمیشە ملی درێژکردو رووەو لەق لەقە هاواری کرد: "ئەهای! وەرە، خێرا بجوڵێ بزانم! هێلکە لەق لەقێ بخە خوارەوە زۆرم برسییە"

لەق لەق وەڵامی دایەوە: "ئای نەخۆرانت بێ دەردو بەڵا بخۆ، ژەهر بخۆ! ئەگەر دەتوانی سەر بکەوەو بمخۆ".

چەقەڵ کە ئەم قسانەی ژنەوت لەسەرسامیدا زاری بەش بووەوەو حاڵی بوو کە لەق لەق دەستەکەی کەشف کردووە. تیا ما کە ئێستا چ بکات، پرسی: "کێ ئەم تەگبیرەی بۆ کردویت؟!" لەق لەق گوتی: "خودانی چوار باغی کەناری چوار چەشمە، قەلە چکۆل فێری کردووم".

چەقەڵ کە گوێی لە ناوی قەلێ بوو، بەرەو چوار باخ رۆیی و خۆی بە باخەکەدا کردو هەر رۆیی و رۆیی تا قەلێکی لەسەر دار چنارێك بینی.

قەلە پێشوەختە دەیزانی کە چەقەڵ دێت بۆ لای، بۆیە تەگبیری هەموو شتێکی کردبوو، چەقەڵ چووە بەردەم قەلێ و پرسی: "تۆ هەمان ئەو قەلە چکۆلەی کە تەگبیرت بۆ لەق لەق کردووە؟"

– بەڵێ، خۆمم.

– کەواتە! با بزانم دەکرێ بۆ ساتێ بێیە خوارەوە؟ دەمەوێ دوو قسانت لەگەڵ بکەم.

– راستیەکەی تاقەتی هاتنە خوارەوەم نییە. هەر ئێستا لە لای لەق لەقە گەڕامەوە، زۆر ماندووم.

– باشە، قەیدی نییە. کە ناتوانی بێیتە خوارێ، خۆت هەڵدە، بەر لەوەی بکەویتە سەر زەوی دەتگرمەوە.

قەلەکە تۆزێ پێکەنی و گوتی: "هۆی کاك چەقەڵ، من قەلەکەی جاران نیم, ئێستا بە خۆت دەبینی کە زۆر قەڵەو بووم، ئێستا رۆژی بەلای کەمەوە 3–4 هێلکە دەخۆم. من زۆر قورس بووم, ناتوانی بمگریتەوەو ئاگات لێم بێ".

چەقەڵە کە گوێی لە 3–4 هێلکە بوو، دەمی ئاوی کردو گوتی: "بەڕاستتە؟ کەواتە وەرە چەند هێلکەیەك بە منیش بدە تا بیخۆم و قەڵەو ببم و تاقەت و شنگم بێتە بەر، ئەوساکە لەسەری چیاشەوە خۆت هەڵدەی دەتگرمەوە.

قەلەکە گوتی: "باشە هێلکەت بۆ دەخەمە خوارێ، بەڵام وریا بە نەکەوێتە سەر زەوی".

چەقەڵ گوتی: "خەمت نەبێ، تۆ رێك بۆ ناو دەمی منی بهاوە، منیش دەمم دەکەمەوە".

**قەلە دوو بەردی سپی، کە پێشوەختە ئامادەی کردبوون، بۆ ناو دەمی چەقەڵە هەڵدایە خوارێ. بەردەکان رێك کەوتنە ناو دەمی چەقەڵەکەو لە گەرووی گیر بوون. چەقەڵەکە تەنیا هاوارێکی کورتی کردو ئیدی نەیتوانی چ کارێك بکات‌و کەوت بە زەویداو مرد.**

## كۆشكی دێوان

كەرێك و ورچێك و بزنێك بوون بە هاوڕێ. ئەمانە هەگبەیەكیان پڕ لە خۆڵەكەوە كردو لە كەرەیان بار كردو كەوتنە ڕێ. بزنە لە پێشی هەموویانەوە بوو. كەرەكەش لە دوای ئەوەوە بوو، ورچەش سواری كەر بوو بوو. ئەمانە هەر ڕۆییشتن و ڕۆییشتن تا گەیینە نزیكی كۆشكێك كە سێ دێوی دەوڵەمەند تیایدا دەژیان، كەرو بزن و ورچ بە یەكتریان گوت: "با بچین بە هەر فێڵ و دەهۆیەك بووە پول و پارەیەك لەم دێوانە بكێشینەوە".

نەخشەیەكیان كێشاو بەرەو كۆشكەكە بەرێ كەوتن.

پاش ماوەیەك بزنەكە لە كەرو ورچەكە جیا بووەوەو بە تەنیا چووە ناو كۆشكەكەوە. سێ دێو لە دەوری یەكدی دانیشتبوون و سێ مەنجەڵی گەورەیان لە بەردەم بوو كە هەڵمی خواردنیان لێ هەڵدەستا. بزنە چووە بەرەوەو سڵاوی لێكردن. دێوەكان مۆڕەیەكیان لێكردو گوتیان: "ئایا دەزانی هەر كەسێك بێتە ئێرە، ئیدی ناگەڕێتەوە؟ ئەگەر سڵاوت نەكردبوایە چارەنووسی تۆش هەر ئەمە دەبوو. باشە ئێستا بڵێ بۆچی هاتوویە ئێرە؟"

بزنە گوتی: "ڕاستییەكەی، هەواڵێكی گرینگم پێیە. پاشای وڵاتی هاوسێتان، بە لەشكرو قۆشەنێكی گەورەوە وا بەرەو ئێرە هێرش دێنێ، دڵم بە حاڵتان سوتاو هاتم تا كۆمەكتان بكەم!"

دێوەكان خەریك بوو چاویان دەردەپۆقی. ڕوویان كردە یەكدی و هەر یەكەیان داوای لەوی دی كرد تا بچێتە سەربانی كۆشكەكەو تەمەشای دەوروبەر بكات.

یەكێك لە دێوەكان چووە سەربانی كۆشكەكەو لەوێندەرەوە هاواری كرد: "وای... چ تەپۆ تۆزێك لەوێندەر هەستاوە! دەڵێی لەشكرێك بەرەو ئێرە دێت"

كەرەكە هەڵی دەتیزاندو تەپۆتۆز بەرز دەبووەوە. وەرچەش كە سواری كەرەكە بوو بوو، بە چنگ خۆڵەكەوەی لە هەگبەكە دەردێناو تۆوی ئەو ناوەی دەكرد. بەمجۆرە بە ئەندازەی دەیان ئەسپ و تەپوتۆزیان دەكرد. دێوێكی دیكەش چووە سەربان و هەركە ئەوانی بینی، هاواری كرد: "وای... بەڕاستی وا بۆ ئێرە دێن!"

پاش كەمێك دێوی سێیەمیش چووە سەربان و هەركە تەپۆ تۆزەكەی بینی، هاواری كرد: "هەر ئێستا بە ئەسپەكانیانەوە دەگەنە سەرمان و هەموومان دەكوژن".

هەرسێكیان زۆر ترسان و هەڵ لەرزین و لەو سەرەوە خۆیان هەڵدایە خوارێ و هەڵاتن و لە كۆشكەكە دووركەوتنەوە. ورچەكەو كەرەكە چوونە كۆشكەكەوەو چوونە لای بزنە. ئەو خواردنانەی كە دێوەكان دروستیان كردبوو، خواردیان و تێر بوون و پارەو جەواهێرو خواردەمەنییەكی زۆریان لە هەگبەكە كردو لێبڕان كە لەوێ بڕۆن. كاتێ گەیینە بەر دەروازەی كۆشك. دێوەكانیان بینی كە بەرەو كۆشكەكە دەگەڕانەوە. كەرو بزن و ورچەكە، خێرا چوونە

سەر دارێکی ناو حەوشی کۆشکەکە. ورچە لەسەر بەرزترین لق دانیشت، کەرەکە نەیتوانی زۆر سەر بکەوێ. بزنە لەسەر لقێکی ناوەڕاستدا گیرسایەوە. دێوەکان دەهاتن تا بزانن چ بەلایەك بەسەر کۆشکەکەیان هاتووە. لێ کە چوونە حەساری کۆشکەکەوە، دیتیان کە جگە لە جێی پێی ورچ و کەرو بزنەکە جێ پێی چ گیانلەبەرێکی دیکە دیار نییە، دێوەکان شوێن پێی ئەوانیان هەڵگرت و گەیینە کەناری درەختەکە. کەرەکە کە زۆر قورس بوو، لقە باریکەکەی ژێری شکاو لەو سەرەوە کەوتە خوارێ.

بزنەکە هاواری کرد: "وای، ئاسمان کەوت بەسەر زەویدا!"

دێوەکان هەر کە ئەم قسەیەیان ژنەوت، خەریك بوو لە ترساندا زراویان بتۆقێ و دیسان هەلاتن، ورچ و کەرو بزنەکەش سەروەت و سامانی دێوەکانیان بردو بۆ گوندەکەی خۆیان گەڕانەوەو ئەو شتانەی کە بردبوویان لە نێو خۆیاندا دابەشیان کرد، ورچەکە دانەوێڵەکان و بزنەکە وێنجەکانی هەڵگرت. کەرەکە کایەکانی هەڵگرت، زێڕەکانیش کەسیان پێویستی پێی نەبوو، لە شوێنێ دایان ناو دەستیان لێ نەدا.

## ئەسپی دەریایی

هەبوو نەبوو، پیرەمێردێ هەبوو کوڕێکی هەبوو بە ناوی (قوچ قارا قولی). پیرەمێرد ڕاوچی بوو و بە ڕاوە ماسی خۆی دەژیان‌و گوزەرانی دەبردە سەر. ڕۆژێك پیرەمێردەکە بێ تاقەت بوو و (قارا قولی) کوڕی بۆ ڕاو نارد.

قارا قولی گەییە شوێنی ڕاوی بابی‌و تۆڕەکەی هەڵدایە دەریاوە. چەند جارێك تۆڕەکەی هەڵکێشایەوەو سەیری کرد، لێ چ هەواڵێك لە ماسییەوە نەبوو. زۆر نیگەران بوو. بۆ دواین جار کە تۆڕەکەی هەڵدا، هەستی کرد تۆڕەکە قورس بووە. تۆڕەکەی هەڵکێشایەوەو لە پڕ بینی کە ماسییەکی هەندێ گەورە کەوتۆتە تۆڕەکەوە. (قارا قولی) ماسیە قورسەکەی بە تۆبزی هەڵگرت‌و بۆ ماڵی هێنایەوە. بابی کە ماسییەکی بینی یەکسەر زانی کە ئەم ماسییە جیاوازە لە ماسییانی دیکەو ئەمە نهێنییەکی تێدایە.

باوکەکە زۆری هەوڵدا بزانێ کە ئەم ماسییە بۆ وا گەورەو زەلامە، بەڵام هیچ حاڵی نەبوو. بە دراوسێ‌و دۆستەکانی نیشاندا بەڵام چ کەسێك سرەکەی نەزانی. ئاخری پیرەمێرد سکی ماسییەکی هەڵدڕی‌و دیتی کە جووانوویەك لە سکی ماسییەکە دایە. جوانوویەك کە هێشتا لەڕو لاواز بوو. باوکەکە حاڵی بوو کە ئەم جوانووە لە توخمی ئەسپانی دەریاییە. یەکسەر ئاوی بە جوانووەکەدا کردو لەشی تەڕ کردو ئەوجا خواردنی دایێ.

جوانوەکە وردە وردە هاتە سەرخۆو لەسەر لاقان وەستا. (قارا قولی) هەموو ڕۆژێك لە وەختی خۆیدا ئاوو ئالیکی بە ئەسپەکە دەدا بەم جۆرە ساڵان بورین‌و (قارا قولی)گەیشتە پازدە ساڵ‌و ئەسپەکەش بوو بە ئەسپێکی چاپوك‌و چالاك‌و هەمیشە خەریکی هەڵبەزو دابەز بوو.

ڕۆژێ لە ڕۆژان (قارا قولی) مۆڵەتی لە بابی خواست کە بچێتە گەشت‌و گوزار. بابی مۆڵەتیدا. قاراقولی سواری ئەسپە دەریاییەکەی بوو و چیاو دەشتانی بڕی‌و ڕۆیی‌و ڕۆیی تا لە ڕێگادا سێ ڕاوچی بینی کە سەرگەرمی ڕاو بوون. یەکێك لە ڕاوچییەکان پاشای میسر بوو و دوو نەفەرەکەی دی، وەزیری بوون. ئەوان لە (قارا قولی)یان پرسی: "تۆ کێی‌و بۆ کوێ دەڕۆیت؟"

(قارا قولی) وەڵامی دایەوە: "کوڕیژگەیەکی بێنەواو تەنیام دەمەوێ ئەگەر ژن‌و پیاوێکی بێ فەرزندم پەیدا کرد، ببم بە کوڕیان"

پاشا گوتی: "من دوو ژنم هەن، یەکێکیان کوڕێکی هەیەو ئەویتریان منداڵی نییە، ئەگەر حەز دەکەی با پێکەوە بچینە لای تا بە کوڕی خۆیت قبوڵ بکات"

(قارا قولی) وەڵامی دایەوە: "باشە، بە مەرجێ بیرێك لە ئەسپەکەشم بکەنەوەو بێ ئاوو ئالیکی نەکەن".

پاشا قاییل بوو و پێکەوە چوون بۆ کۆشکەکەی.

رۆژێ لە رۆژان پاشا ئاهەنگێکی گەورەی بەرپا کرد. پاڵەوانان لە مەیداندا زۆرانیان گرتو ئەسپیان لە دەوری یەکتر خڕبوونەوەو ئامادەی پێشبڕکێ و جریدبازی بوون، (قارا قولی)ش لێرا بەشدرای پێشبڕکێیەکە بکات. کوڕی پاشاش سواری خۆشبەزترین ئەسپی پاشا بوو و لە ریزی ئەواندا جێی گرت. پێشبڕکێ دەستی پیکرد. کوڕی پاشا زۆر زوو پێشی هەموویانی دایەوە. بەلام قاراقولی لەگەلْ ئەوانی دیدا غاری داو نەیهیشت ئەسپەکە لە سەرەتای پێشبڕکێیەکەوە خێرا را بکات. لە ئاخرو ئۆخری پیشبرکێیەکەدا جلەوی بۆ ئەسپەکە شل کردو لێی گەرا بەوپەڕی خێرایی تاو بدات. ئەسپی دەریایی وەك ئەوەی باڵی گرتبێ دەرپەڕێ و وەکو با بۆی دەرچوو و هەموو ئەسپەکان و ئەسپی کورەکەی پاشاشی بەجێ هێشت, وەکو تیری لە کەمان دەرچوو, لە هێڵی کۆتایی پێشبڕکێیەکە رەت بوو. هەموو تەمەشاڤانان لەسەرسامیدا زاریان بەش کردەوە.

شا توڕە بوو و دەستوری دا کە پێشبڕکێیەکی دی لە نێوان ئەسپەکەی خۆی و ئەسپە دەریاییەکەی (قارا قولی)دا بکرێ.

پێشبرکێیەکی دیکە دانرا. کوڕی پاشا سواری ئەسپی پاشا بوو و قاراقولی سواری ئەسپە دەریاییەکەی. ئەمجارەیان قاراقولی جڵەوی ئەسپەکەی رانەکێشا و ئەسپەکە وەکو باڵدار بۆی دەرپەڕی و لە کاتێکا کوڕی پاشا گەیی بووە نیوەی رێگا, ئەسپەکەی قاراقولی لە هێڵی کۆتایی پێشبڕکێیەکە رەت بوو. پاشا ئەمجارەیان، براوەیی ئەسپە دەریاییەکەی قەبوڵ کردو بە باشی پێشوازی لە قاراقولی کردو خەڵاتو دیارییەکی زۆری پێ بەخشی.

بەلام ژنی پاشا کە دۆڕانی کوڕەکەی دیتبوو توڕە بوو بوو و بڕیاریدا کە قاراقولی بکوژێت. بۆیە ژەهرێکی لە تەبیبێ وەرگرت تا دەرخواردی بدات.

رۆژێ قاراقولی سپێدە زوو بێدار بووەوەو بینی ئەسپەکەی فرمێسك دەڕێژێت. قاراقولی پرسی: "بۆچی دەگریت؟!"

ئەسپەکە وەلامی دایەوە: "ژنی پاشا دەیەوێت دەرمانخواردت بکات. تۆ نابێ خواردنی ئەوان بخۆیت"

قاراقولی گوتی: "باشە ئەسپی ئازیزم! من لە قسەکەی تۆ دڵنیام. دڵنیابە کە دەمی تێوە نادەم".

خواردنێکیان بۆ قاراقولی هێنا. هەندێکی لێدا بە پشیلەیەك تا تاقی بکاتەوە. پشیلەکە لەرزیو کەوتە سەر زەوی‌و مرد.

قاراقولی بە تەواوی پەی بە پیلانەکەی ژنی شابردو خواردنەکەی نەخواردو رشتی. ژنی شا چاوەڕوان بوو کە قاراقولی بمرێت، کەچی بینی ساغو سەلیمە، ژنە حاڵی بوو کە رازێك لەم ئەسپەدا هەیەو تا ئەو نەکوژێ، ناتوانێ قاراقولی لە نێو بەرێت، بۆیە لێبڕا ئەسپەکە بکوژێت. ژنێکی تەبیبی پیری پەیدا کرد تا تەگبیرێکی بۆ بکات.

پیرەژن گوتی: "تۆ خۆت نەخۆش بخەو لەجێدا بکەوەو کەسێکم بە دوودا بنێرە تا پێم مالیجەت بکەم. ئەوسا خۆم دەزانم کە چ کارێك بکەم، تۆ خەمت نەبێ".

رۆژی پاشتر پاشا چووە راوێ. ژنی پاشا خۆی نەخۆش خستو بەڕواڵەت لەرزی لێهاتو چووە ناو جێ، دەربارییان لە دەوری خڕبوونەوەو ئەحواڵیان پرسی، ژنە ویستی ئەو تەبیبە پیرەی بۆ بێنن. تەبیب هاتو گوتی: "دەردی تۆ تەنیا یەك دەرمانی هەیە، تا زووە دەبێ گۆشتی ئەسپی دەریایی پەیدا بکەن تا بیخۆیت. ئەگینا هەرگیز چاك نابێتەوە".

غولامان زوو ئامادە بوون تا گۆشتی ئەسپی دەریایی بۆ بێنن. قاراقولی تکاو رجای کرد کە تا پاشا لە راو دەگەڕێتەوە سەبر بکەن. لێ غولامان گوێیان پێی نەداو چوون تا ئەسپەکە لە تەویلە بێننە دەرێ. کە گەیینە ئەوێندەر، دیتیان ئەسپێکی جوانو ناو قەد باریك لە تەویلەکەدایەو فرمێسك هەڵدەڕێژێ. غولامەکان، دڵیان نەهات کە ئەسپێکی ئاوها بکەنە قوربانی. لەو کاتەدا پیرەژنە تەبیبەکەش گەییە سەریانو هەڕەشەی لە غولامەکان کرد کە تا زووە ئەسپەکە بکوژنەوە. چوکە ئەگەر زوو گۆشتی ئەسپەکە فریای ژنی پاشا نەخەنو حاڵی خراپتر ببێ، ئەوا گوناهی مردنی ژنی پاشا دەکەوێتە ئەستۆی ئەوان.

غولامان لە ئاقیبەتی کار ترسانو لاقی ئەسپەکەیان بە گوریس بەستو دایان بە عاردیدا. لەم کاتەدا هەواڵ هات کە پاشا خەریکە لە راو دەگەڕێتەوە. غولامان بڕیاریاندا کە چاوەڕێی پاشا بکەن تا بزانن ئەو چ دەڵێت. پاشا هاتەوە بەسەرا.

پیرەژن چووە پێشوازیو گوتی: "ئەگەر ئەسپە دەرياییەکە نەکوژینەوەو گۆشتەکەی دەرخواردی هاوسەرەکەت نەدەین، هاوسەرەکەت دەمرێت".
شا ماوەیەك بیری کردەوەو فەرمانیدا کە غولامان ئەسپەکە بکوژنەوە. قاراقولی مۆڵەتی لە پاشا خواست کە بۆ دوا جار ئەسپەکەی ببینێ، شا مۆڵەتی دایێ. قاراقولی چووە تەویلەکەوەو پەتی لاقی ئەسپەکەی کردەوەو ئەسپەکەی هەستاندو سواری بوو. ئەسپەکە بە قاراقولی گوت: "چی بکەین؟"

قاراقولی گوتی: "هەڵدێین"

ئەسپەکە گوتی: "کەواتە توند خۆتم لە سەر پشت بگرە. هەوەڵجار ئەو پیرێژنە فێڵبازە بە سزای عەمەلی خۆی دەگەیەنم، پاشان هەڵدێین"

ئەوجا ئەسپەکە لەسەر هەردوو پاشووی هەستاو تا توانی حیلاندی، حیلە خۆشەکەی گەییە گوێی هەمووانو هەموویان خڕبوونەوە. پیرەژنەکەشیان لە ناودا بوو. ئەسپەکە کە چاوەڕێی ئەوی دەکرد، بۆی چوو و خستیە ژێر لاقەکانیو دەست بەجێ کوشتی. قۆچ قاراقولیو ئەسپەکەی، بەغار لە حەوشەی کۆشکەکە وەدەرکەوتنو شاریان بەجێ هێشت، ژنی پاشا بە ژنەوتنی هەواڵی مەرگی پیرەژن، زۆر ترساو لەجێ هەستاو چوو بۆ لای پاشا, پاشا حاڵی بوو کە ژنە بە درۆ خۆی نەخۆش خستووەو هەموو ئوێنو بەلاکان لە ژێر سەری ئەودان. دەستووریدا کە لە قەنارەی بدەن. بەم جۆرە هەم ژنی پاشاو هەم پیرەژن، بە سزای کردەوەی خۆیان گەییشتن.

# قەلە رەش و ڕێوی

لە زەمانی کۆندا، قەلێك و ڕێوییەك بوون بە دۆست. ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕێوی، قەلەی دەعوەت کرد. قەلە چوو بۆ ماڵی ڕێوی. ڕێوی نیوەرۆژەی لێناو بە ئانقەست خواردنەکەی هەڵڕشتە سەر قاپێکی زۆر پان و سفرەی داناو بە قەلەی گوت: "فەرموو دۆستی ئازیز! خواردنێکی زۆر بەتامە"

قەلە هەرچی کۆشا خواردن بخوا، نەبوو. دەنوکە درێژەکەی وەبنی قاپەکە دەکەوت و جگە لە تۆزقاڵێك خواردن چی نەدەچووە دەمەوە. ڕێوی خێرا خێرا خواردنەکەی دەخواردو زوو هەمووی تەواو کردو قاپەکەشی لستەوە. قەلەکە بە برسێتی مایەوەو ناڕەحەت و نیگەران بوو و بڕیاریدا کە درەنگ یان زوو ئەم هەقە لە ڕێوی بکاتەوە. ڕۆژێك قەلێ، ڕێوی دەعوەت کرد. ڕێوی چووە ماڵی قەلێ. قەلەش خواردنێکی بەلەزەتی لێناو هەڵی ڕشتە ناو کودییەکی ناو بەتاڵی بچووك و هێنای. کودییەکە هەر دەنووکی قەلەکەی پێدا دەچوو. قەلە گوتی: "بخۆ ڕێوی گیان! خواردنەکەت سارد دەبێتەوە!"

ڕێوی هەرچی کۆشا بخوات، نەیتوانی. چونکە دەمی نەدەچووە کودییەکەوە. بۆیە لە ناچاریدا تەنیا دەمی کودییەکەی لستەوە. قەلە بێ گوێدان بە ڕێوی، دەنوکی دەکودی دەکردو تا دەیتوانی دەیخواردو دەیگوت: "ڕێوی گیان! دەبخۆ ئیدی، بۆ شەرم دەکەی!"

ئاخری ڕێوییەکە بە نائومێدییەوە گوتی: "زۆر مەمنونم، زۆرم خوارد!"

ڕێوی دوعاخوازی لە قەلە ڕەش کردو بۆ ماڵی خۆی گەڕایەوە. زۆر لەوە قەڵس بوو کە فریوی قەلەی خواردبوو، و حەزی دەکرد تۆڵەیەك لە قەلە بکاتەوە. بۆیە ڕۆژێ پێی گوت: "وەرە با پێکەوە بچینە گەڕان. من فێری گەمەی ڕێویانت دەکەم!"

قەلە قایبل بوو و پێکەوە ڕۆییشتن و گەییشتنە مەیدانێك. ڕێوی گوتی: "دۆستی ئازیز! وەرە با دەست بە گەمەکە بکەین، تۆ توند کلکی من بگرەو تا خۆم نەڵێم بەری مەدە"

قەلە گوتی: "باشە."

و کلکی ڕێویەکەی گرت. ڕێوی دەستی بە غاردان و خولانەوە کرد. لە مێرگوزارەوە بۆ دەشت چوو و لە دەشتەوە بۆ مێرگوزار هات. هەر غاریداو غاریداو قەلەی بەملاو بەولادا بردو بەسەر زەویدا رایکێشا. لەشی قەلە پڕ بوو لە برین. زۆر ترساو گوتی: "وای دۆستی ئازیز! من فێری گەمەی ڕێویان بووم، ئیدی بەسە، ئەگەر دەتەوێ نەمرم، بوەستە!"

ڕێوی گوتی: "باشە، مادام فێری گەمەی ڕێویان بووی، دەوەستم."

وەستاو ئاوڕی دایەوەو بینی تاقە پەڕێك بە لەشی قەلەکەوە نەماوەو گۆشتی لەشی بە دەرەوەیە.

چەند ڕۆژێك بوری. قەلە باش بە خۆی ڕاگەییشت. برینەکانی چاك بوون, پەڕی دەرکردەوە. ڕۆژێك قەلە، ڕێوی بانگ کردو گوتی: "وەرە با بچین بۆ مەیدان و فێری گەمەی قەلانت بکەم!"

ڕێوی قاییل بوو. بە دوو قۆڵی چوون بۆ مەیدانی گەمە. قەلە گوتی: "ڕێوی گیان! تۆ لەسەر پشتی من دانیشەو توند خۆت بگرە"

ڕێوی لەسەر پشتی دانیشت. قەلە لە شەقەی باڵیداو چوو بە ئاسماندا. لە ڕێگەدا، قەلە لێکدا لێکدا لە ڕێوی دەپرسی: "زەوی دەبینی؟"

ڕێوی وەڵامی دەدایەوە: "بەڵێ".

دوای هەر وەڵامێك، قەلە بەرزترو بەرزتر دەبووەوەو لە زەوی دوورو دوورتر دەبووەوە. تا ڕێوی گوتی: "قەلی ئازیز! ئیدی لەوە بەرزتر مەبەوە. من دەترسم. ئێستا زەوی بە هیچ جۆرێ نابینم".

قەلە گوتی: "کەواتە ئێستا دەتوانم بەرت بدەمەوە"

و ڕێویەی بەرەڵڵا کرد. ڕێوی هاواری کرد!" وای ئێستا دەمرم. کاشکێ دەکەوتمە ناو ئاو یان سەر کا".

بەڵام ڕێوییەکە ڕێك کەوتە سەر زەوییەکی ڕەق و سەخت و وردو خاش و هەپرون بە هەپڕون بوو.

## حەیوانێکی سەیر

هەبوو نەبوو، لە زەمانی کۆندا، مانگایەك‌و کەرێك‌و بزنێك و ڕێوییەك بوون بە دۆست. ئەمانە ڕۆژێك بڕیاریاندا کە بچنە مێرگوزارێکی جوان‌و خۆش. بەڵام گیروگرفتێکمان هەبوو. ئەو شوێنە، جێی هاتوچۆی پڵنگان بوو، بۆیە بۆ ئەوان مەترسیدار بوو.

چەند ڕۆژێك دوو دڵ بوون تا ئاقیبەت ناوی خوایان لێ هێناو گوتیان: "هەرچی دەبێ با ببێ"و بەڕێ کەوتن. ئەو چوار دۆستە گەیینە شوێنێکی سەوزەڵانی خۆش‌و کەوتنە سەیران. ڕۆژێ ڕیچۆی بە دۆستەکانی گوت: "چەند پڵنگێکم لە پشت ئەو گردەوە بینی"

مانگا گوتی: "بەڕاستە؟ خوا بکات پێمان نەزانن"

کەر گوتی: "کەوایە نابێ دەنگمان بەرز بکەینەوە، ئەگەر گوێیان لێمان بێ بۆمان دێن"

بزن گوتی: "وا چاکە هیچ قسەیەك نەکەین"

هەموو ڕێککەوتن و چەند ڕۆژێکیان، بەبێ ئەوەی تاقە قسەیەك بکەن, گوزەراند. ڕۆژێك کەرەکە رووی کردە دۆستەکانی‌و گوتی: "من لەوەی پتر هەڵناکەم, حەز دەکەم بزەڕم!"

بەڵام ئەوانی دی گوتیان: "نا، کاری وا نەکەی، پڵنگەکان دەنگت دەژنەون‌و بۆمان دێن"

ئەوان لە کەرەکە پاڕانەوە، بەڵام کەر گوتی: "وای، ئەگەر نەزەڕم دەبورێمەوە، لە هۆش خۆم دەچم, پێویستە بزەڕم"

ئاقیبەت هاوڕێکانی گوتیان: "باشە، ئەگەر هەر تەحەمول ناکەی، ئەوا زۆر بە ئەسپایی بزەڕێنەو نەکەی یەك کەڕەت دەنگی لێ بەرز بکەیەوە"

کەر، قەبوڵی کردو چووە سەر گردێك‌و کەوتە زەڕین، سەرەتا هێدی هێدی دەزەڕی، بەڵام پاشان و لە پڕ دەنگی لێ هەڵبڕی. زەڕەی کەرەکە لە گردو دەشتەکاندا دەنگی دایەوەو گەییە گوێی پڵنگێك. پڵنگە یەکسەر بەرەو دەنگەکە چوو. ڕێوی بە ترسەوە چوو بۆ لای کەرەو گوتی: "ئەی کەر چەند جار لێت پاڕامەوە کە نەزەڕی؟ ئێستا دەزانی چ ناماقوڵیەکت کردوە؟ هاکا هەموو پڵنگەکان بێن‌و لەت‌و پەتت بکەن"

کەرەکە لەرزی‌و گوتی: "وای ڕێوی گیان! فریام بکەوە. بێگومان تۆ فڕوفێڵی زۆرت لایە. وەرەو فێڵەکانت بخەکار. دەنا هەموومان تیا دەچین".

ڕێوی گوتی: "ئەگەر بەڵێن بدەی کە لە ئێستا بە دواوە، هەرچییەك من گوتم، وا بکەی، فێڵێك دەدۆزمەوە"

کەر گوتی: "ڕێوی گیان! تۆ گیانی من نەجات بدە، ئەوسا شەوو ڕۆژ سواری پشتم بی هەر قەیدی ناکا"

ڕێوی قاییل بوو و داوای لە کەرەکە کرد کە لەسەر هەروو دەستی دانیشێ. کەرە دانیشت‌و ڕێوی سواری ملی بوو. پڵنگێك گەییە نزیکیان. ڕێوی گوتی: "با بە جووتە هاوار بکەین"

ڕێوی و کەر، بە جووتە کەوتنە هاوار. دەنگیان لە دەشت و دۆڵەکاندا دەنگی دایەوەو هەموو شوێنێکی هێنایە لەرزە.

پڵنگەکە کە دەهاتە پێشێ، کە ئەوانی پێکەوە بینی و گوێی لە دەنگیان بوو، مات و سەرسام هەنگاوێ بۆ پاشەوە چوو. چونکە لە ژیانیدا نە دەنگی وەهای ژنەوت بوو و نە حەیوانی وەهای بینی بوو. ڕێوی و کەرەکە کە دیتیان پڵنگەکە پەرێشان بووە، هەنگێ جورئەتیان پەیدا کردو زیاتر دەنگیان لێ هەڵبڕی و پڵنگەکە زۆر ترساو تێی تەقاندو هەڵهات. لەو کاتەدا پڵنگەکە چاوی بە ورچێك کەوت. ورچە لە پڵنگی پرسی: "ئەهای پڵنگ ئەوە چیتە؟ لە دەستی کێ هەڵدیی؟"

پڵنگ گوتی: "تۆزێ لەمەوپێش یەکێك لەسەر ئەو گردەوە زەڕاندی. من پێم وابوو دەنگی کەرەو بەدەم دەنگەکەوە بۆ ئەوێ چووم, بەڵام بۆم دەرکەوت کە دەنگەکە نە دەنگی کەر بوو, نە دەنگی پشیلەو نە دەنگی هیچ حەیوانێکی تر. من تا ئێستا دەنگی وەهام نەبیستووە. خودی حەیوانەکەش لە دەنگەکەی سامناکتر بوو. دوو لاقی هەبوو. گەردنی لە ورگی زلتر بوو. لاقی لە گەردنی گەورەتر. حەیوانێکی سەیر بوو. هەر کە بینیم یەکسەر هەڵاتم"

ورچ گوتی: "پڵنگ گیان! باوەڕ ناکەم لەم دەڤەرەدا حەیوانی وا سەیر هەبێ. بێگومان ئەو حەیوانەی دیوتە، کەر بووەو تۆی خاپاندووە"

پڵنگ گوتی: "مەحاڵە کەر بتوانێ من فریو بدات"

ورچ گوتی: "من ژنەوتوومە کە کەرێك و بزنێك و مانگایەك و ڕێوییەك بوون بە دۆست و بەرەو ئەم ناوە هاتوون. لەوەیە ئەو کەرە هاوڕێکانیشی لەگەڵ بووبن"

داوای لە پڵنگەکە کرد کە بگەڕێتەوە، بەڵام پڵنگەکە زاتی لە دەست دابوو و ئامادە نەبوو بگەڕێتەوە. ئەنجام قەراریاندا کە بە دوو قۆڵی بڕۆن و لە یەکدی دوور نەکەونەوە، دوو سەری پەتێکیان بەسەری خۆیانەوە بەست و بە دووری یەك شەقاو لە یەکدییەوە وەڕێ کەوتن.

کەرو دۆستەکانی ئەو جووتەیان بینی کە دێنە بەرەوە، بە یەکتریان گوت: "ورچ و پڵنگ بەرەو لای ئێمە دێن، ئێستا چ بکەین؟"

ڕێوی گوتی: "من جگە لەم هەیکەلە قەڵەوەم, چەکیکی دیم نییە"

کەر گوتی: "منیش تەنیا دەنگە زلەکەم هەیە"

بزن گوتی: "کەواتە ئێستا چ بکەین؟"

چەندیان بیر کردەوە، ئەقڵیان بە هیچ کوێ ڕانەگەییشت. بە ترسەوە خێرا سەرکەوتنە سەر درەختێك، ڕێوی چووە سەر بەرزترین لق. بزنەکەش چووە سەر لقێکی خوار ئەوەوە. کەرو مانگاکەش کە قورس بوون، لە بنی درەختەکەدا مانەوە. پڵنگ و ورچەکە گەیینە نزیکیان ڕێوییەکە لەرزی و لەو سەرەوە کەوتە خوارێ. بزنەش لەرزی و کەوتە خوارەوە. مانگاکە کە لە وێندەر وەستابوو، ئەوەندە ترسا، ئەوەندە ترسا لە تاوا کەوتە بۆڕە بۆڕ. کەرەکەش بە دەنگی بەرز کەوتە زەڕین، دەنگیان تێکەڵ بوو و وەکو نەعرەتەی دێوێك بەر گوێی پڵنگ و ورچەکە کەوت، پڵنگەکە لە هەوەڵەوە ترسا بوو، هەر کە گویی لە دەنگەکە بوو هەنگاوێ گەڕایەوەو هەڵهات، ورچەکە ویستی ڕای بگرێت، بەڵام پڵنگەکە وەکو با هەڵهات و توند پەتەکەی ڕاکێشاو

بێ ئەوەی ئاگای لێ بێ، سەری ورچەکەی، کە بە سەرەکەی تری پەتەکەوە بەسترابوو، لە لەشی جیاکردەوەو لەگەڵ خۆیدا بردی. ماوەیەك رای کردو پاشان ئاوڕی دایەوەو بینی شتێك بە دویدا دێت. جوان دیقەتیدا سەیری کرد سەری ورچەکەیە. پڵنگەکە زۆر ترساو لە دڵی خۆیدا گوتی: "وای! ئەو حەیوانە سەیرە، ورچەکەی خواردووەو تەنیا سەرەکەی هێشتووەتەوە. هاکا هەڵی کوتایە سەری منیش. نابێ بۆ ساتێك لەم ناوە بمێنم".

تا هێز لە لاقی دا بوو غاریداو هەڵات.

## دەوڵەمەندی پیسەکەو مار

لە زەمانی کۆندا، پیاوێکی هێندە دەوڵەمەند هەبوو کە جێ نەبوو سەروەتی تێ دابنێ. ئەم پیاوە تۆزقاڵێك رەحمو بەزەیی نەبوو و کۆمەکی بە کەس نەدەکردو ئەهلی بەخشش‌و چاکە نەبوو. ئەگەر میوانێك رووی کردبا ماڵەکەی تەنیا نانی وشکی بۆ دادەنا, لێ بە خۆی بە تاقی تەنیا بەقەد دە نەفەری دەخوارد. ئەگەر بیویستایە بۆ شوێنێ بڕوات، یەکەم راسپاردەی بۆ ژنەکەی ئەوە بوو کە ئاگای لە سەروەتەکەی بێ‌و کەم خەرج بکات.

رۆژێ لە رۆژان بیستی کە لە ئۆزبەکستان مەڕو ماڵات هەرزان بووە. کابرای دەوڵەمەند سێ‌و دووی لێ نەکردو بەرەو ئەوێندەر کەوتە رێ. جگە لە ژنەکەی و بوکەکەی کەس لە ماڵەوە نەما. کوڕەکەشی کە شوان بوو، هەمیشە بە دەشت‌و دەرەوە بوو. کابرای دەوڵەمەند بە سواری ئەسپ دەڕۆیی، لە پڕ چاوی بە قوتوویەکی تەنەکەی جوان کەوت کە لەسەر ئەرزەکە کەوتبوو. خێرا لە ئەسپەکەی دابەزی‌و سەری قوتووەکەی کردەوە. لەو کاتەدا مارێکی گەورە لە قوتوەکە دەرپەڕی‌و لە گەردنی کابرای دەوڵەمەند ئاڵا. کابرا کە زۆر ترسا بوو، هەستی بە خنکان کرد. هەرچی کۆشا مارەکە لە گەردنی خۆی بکاتەوە، فایدەی نەبوو. کابرای دەوڵەمەند لە ئەنجامدا بە تۆبزی هاتە زمان‌و گوتی: "ئەی مار! بۆچی واهی لە گەردنم ئاڵاوی؟ ئاخر چ خراپەیەکت لە من دیتووە؟"

مارەکە گوتی: "مەگەر نەت بیستووە کە پاداشتی چاکە خراپەیە؟ ئەمە پەندێکی باوە"

– نا، نا، ئەمە راست نییە، پاداشتی چاکە، چاکەیە. من تۆم لە قەفەز رزگار کرد، تۆش وازم لێ بێنە.

مارەکە گوتی: "قسەکەتم قەبوڵ نییە"

دەوڵەمەندی پیسکە گوتی: "ئەگەر حەز دەکەیت با بچینە لای چەند کەسێك‌و با شەرعمان بکەن، ئەوان هەرچییەکیان گوت، من قەبوڵی دەکەم. ئەگەر هەق بە تۆ بوو، ئەوسا دەتوانی سوك‌و ئاسان بمکوژیت. بەڵام ئێستا ئەوەندە ملم گوشار مەدە"

مارەکە قەبوڵی کردو خۆی لە ملی دەوڵەمەندەکە شل کرد. بەر لە هەموو کەسێك چوونە لای مێگەلە مەڕەکانی کابرای دەوڵەمەند. سەگێکی پیر چاودێری مەڕەکانی دەکرد. لە سەگە پیرەکەیان پرسی: "ئەرێ راستە کە دەڵێن پاداشتی چاکە، خراپەیە؟"

سەگەکە وەڵامی دایەوە: "بەڵێ دروستە. هەر چەند چاکە بکەی. تەنیا خراپە دەبینییەوە"

ئەوجا رووی لە کابرای دەوڵەمەند کردو گوتی: "گوێ بگرە ئاغا! من ئەوە چەندین ساڵە کە چاودێری‌و ئاگاداری پەزەکانت دەکەم‌و نەم هێشتووە دەستی گورگێك بە مەڕەکانت بگات. لێ تا ئێستا، نە من‌و نە شوانەکە، هیچ کاممان تۆزقاڵێك گۆشتمان نەخواردووەو خواردنمان هەر نانی وشکی کەڕووداره. بەڵام ئەگەر خوا نەکردە، مەڕێکت ئەجەلی بێ‌و بمرێ، رۆژمان لێ تاڵ دەکەی. ئەمە خراپە نییە کە لە بری چاکە دەیکەی؟"

کابرای دەوڵەمەند ڕەنگی زەرد بوو و سەری داخست, مارەکە بە کابرای دەوڵەمەندی گوت: "ئێستا جوابی خۆت وەرگرت؟ ئامادە بە تا پێوەت بدەم!"

دەوڵەمەندەکە لەرزی‌و گوتی: "نا، ماری ئازیز! سەبرکە، سەگ ناتوانێ وەڵامی دروست بداتەوە. با لە کەسێکی تر بپرسین"

مارەکە قاییل بوو و پێکەوە چوونە نک مەڕو بزنەکان‌و پرسییان: "ڕاستە کە دەڵێن پاداشتی چاکە خراپەیە؟".

مەڕو بزنەکان وەڵامیان دایەوە: "بەڵێ ڕاستە، ئێمە ساڵانە چەندین بێچوو بەرخۆلەو کارژۆڵە بۆ ئاغا دێنین‌و ژمارەی مەڕەکانی زیاد دەکەین، کەچی ئەو هیچ بیرێك لە حاڵی ئێمە ناکاتەوە. بۆ لەوەڕی ئێمە شوێنی بژۆێن فەراهەم ناکات‌و مەجبوورین هەمیشە لەم شوێنە وشك‌و بێ ئاوو گیایە بلەوەڕین"

کابرای دەوڵەمەند دیسانەوە وەڵامی پێچەوانەی ژنەوت، گوتی: "با لە وشترەکانیشم بپرسین"

مارەکە قاییل بوو و پێکەوە چوونە لای وشترەکان‌و لە وشترێکی پیریان پرسی: وشتری پیر ئاهێکی هەڵکێشاو وەڵامی دانەوە: "ئەم وشترە جاحێڵانە دەبینن؟ هەر هەموویان لە منن‌و من هێناومن‌و بۆ ئاغام گەورە کردوون. لێ ئەم ئاغا بێ بەزەییە، تاکو ئێستا هیچ هەواڵێکی منی نەپرسیوە. زستانانی سارد، شوێنی گەرمم نییە. ددانیشم نەماوە تا خواردنەکەم بجووم، لێ ئاغا گوێ بە من نادات. پاداشتی چاکەی من ئەمەیە؟"

دەوڵەمەندی پیسکەکە دیسان وەڵامێکی توندی ژنەوتبوو، پەریشان بوو و گوتی: "وەرە با بۆ دواجار لە یەکێکی دیکەش بپرسین، ئەگەر ئەمجارەش مەحکوم کرام، ئامادەم کە بمکوژی"

ڕۆییشتن‌و لە بووکەکەیان پرسی بوکێ بە خەمبارییەوە وەڵامی دایەوە: "هەر چەندە خانەوادەی ئێمە زۆر دەوڵەمەندە، بەڵام ئەم پیاوە نایەڵێت کە ژەمە خواردنێکی باش بخۆین‌و جلێکی باش لەبەر بکەین. لە کاتێکدا ئێمە شەوو ڕۆژ کاری ماڵەکەی بۆ بەڕێوە دەبەین".

کابرای دەوڵەمەند لە وەڵامی بووکەکەی سەرسام بوو.

مارەکە گوتی: "ئێستا بە ئەندازەی کافی پرسیارمان کرد، تۆ پاداشتی چاکەت بە خەراپە داوەتەوەو هەنووکە دەبێ خەراپە بدینی"

مارەکە گوشاری خستە سەر گەردنی کابرا. کابرای دەوڵەمەند کە خەریك بوو دەخنکا، گوتی: "ئاە، هەق بە تۆیە. ڕاستیان گوتووە کە پاداشتی چاکە خراپەیە. هۆیەکەشی پیسکەیی‌و حەسودی من‌و خەڵکانی وەك منە. بەڵام ئەی ماری ئازیز! تۆ ڕەحم بە مندا بکە. قەول دەدەم کە لەمەو دوا پیسکە نەبم. تکا دەکەم بەرەڵڵام بکە"

مارەکە گوتی: "من لەم قسانەم زۆر ژنەوتووە"

و بە کابرای دەوڵەمەندەوەی داو کوشتی.

## کێ گەورە ترە؟

هـەبوو نـەبوو لـە زەمـانی کۆنـدا ڕێوییـەکی چـکۆلە هـەبوو کـە زۆربـەی ڕۆژان ڕاوی دەسـت نەدەکەوت و بە برسێتی دەمایەوە.

ڕۆژێـك کـە ڕێوییەکـە ئـاوارەو سـەرگەردان دەگـەڕا، چـاوی بـە گـورگێ کـەوت کـە بـە دووی کەروێشـکێکدا غـاری دەدا. گورگەکـە هـەر چـەند ڕای دەکـرد نەیـدەتوانی بـە کەروێشـکەکەدا بگـا.

ڕێوییەکە لە دڵی خۆیـدا گـوتی: "وا چاکە منیش لەگەڵ گورگەکـەدا دووی کەروێشـکەکە بکـەوم، ئەگـەر گورگـە کەروێشـکەکەی گـرت، ئـەوا بـە حیلـەو حەواڵـەش بـوو بـێ، هـەر بەشـی خـۆمی لـێ دەسەنم".

و شان بە شانی گورگە کەوتە غاردان. ماوەیەکی زۆر غاریاندا. ئاقیبەت کەروێشکەکە مانـدوو بـوو و وەسـتا. گورگـەش کـە زۆر مانـدوو بـوو بـوو، تاقـەتی بـڕا بـوو. کەروێشـك و گـورگ توانـای جوڵـەیان لەبـەر بـڕا بـوو، و لـەو گـۆڕە کـەوتن ڕێوییـەش وای نوانـد کـە هـیلاك بـووە، لەبـەردەم کەروێشـکەکەدا وەرکـەوت. گورگـە گـوتی: "ئـەهای ڕێـوی! ئێمـە لـە ماندوێتیـدا کـەوتین. تـۆ بـۆ وەردەکەوی؟"

ڕێوی وەڵامی دایەوە: "ئەی گورگی میهرەبان، مەگەر نابینی منیش هێندەم غارداوە کە تاقەتم لێ بڕاوە. ئێستاش بەردەم کەروێشکەکەم گرتووە تا غار نەکات"

گورگ گوتی: "مەمنونم. بەڵام خۆ تۆ چاوت نەبڕیوەتە کەروێشکەکە؟ ئەگەر بـە تـەمای بـە دوو قۆڵی ئەم کەروێشکە بخۆین، ئەوا هیچمان تێر ناکات".

ڕێوی گوتی: "کەواتە کێ گەورەتر بوو با ئەوە بیخوات"

گورگە قاییل بوو. ڕێوی گوتی: "دۆستی من! تۆ، بڵێ بزانم، چەند ساڵی؟"

گورگە بە درۆ گوتی: "من زۆر گەورەم. سەد ساڵ لەمەوپێش هاتوومە دنیاوە"

ڕێوییەکە ناڵەیەکی کردو گوتی: "ئاه، ڕاست دەکەی؟"

هۆن هۆن گریا، گورگە پرسی: "بۆچی دەگریت؟"

ڕێوی وەڵامی دایەوە: "ئاه، ڕێك ئەو زەمانەی کە تـۆ هاتویـە سـەر دنیـا، کوڕە چـل ساڵانەکەم مرد. چما دەکرێ نەگریم؟ کوڕەکەت هێنامەوە یاد!"

گورگەکە حەپەساو ڕێویەکە بەسەر گورگەکەدا سەرکەوت و کەروێشکەکەی خوارد.

## چەقەڵ و ڕێوی

هەبوو نەبوو پیرێژنێك هەبوو لە گوندێکدا دەژیا. پیرەژن مریشکێکی هەبوو کە نابوویەوە تا جوجەڵەی بۆ هەڵبێنێ. هەر شتێکی لە دانەوێڵەو نان پەیدا کردبا دەیرشتە بەر مریشکەکە. تا مریشکەکەی تەواو قەڵەو بوو.

ڕۆژێك چەقەڵێکی برسی کە بۆنی بە عاردییەوە دەکردو بە دوای خواردنا دەگەڕا، چاوی بە کولانەی مریشکەکە کەوت و مریشکە قوت و قەڵەوەکەی بەدی کردو خێرا کردی بە ملیاو مریشکەی هەڵگرت و تێی تەقاند.

جوجەڵەکان کە تازە لە هێلکە هاتبوونە دەرێ، کردیان بە هات و هاوارو جوکە جوك و بانگی دایکیان کرد. دەنگیان گەییە گوێی پیرەژن. پیرەژن هات و سەیری کولانەکەی کردو بینی کە مریشکە قەڵەوەکەی دیار نییە. یەکسەر تێگەیی کە کار، کاری چەقەڵی بەدجنسەو کەوتە هاتو هاوار: "ئەی چەقەڵی بێ بەزەیی! دەست و پێت بشکێ، جوجەڵە داماوەکانت هەتیو خستم!"

هێندەی هاوار کرد تا هەموو خەڵکی گوند گوێیان لێی بوو و لەبەرماڵەکەیدا خڕ بوونەوەو پرسیان خێرە؟ چ قەوماوە؟"

پیرەژن هەموو شتێکی گێڕایەوەو گوتی: "مریشکە نازدارەکەم زۆر قەڵەو بوو. دە کیلۆ دەبوو. حەیف!"

پیرەژن زۆر ناڕەحەت بوو و باقی دێهاتییەکانیش ناڕەحەت بوون.

جا بێینە سەر چەقەڵەکە. چەقەڵە مریشکەکەی بە دەمەوە بوو و هەر رای دەکرد. لە پڕ ڕێوییەك لە بەردەمیا قوت بووەوەو گوتی: "ها چەقەڵ گیان! ئەو پیرەژنە بۆ وا هاتو هاوار دەکا؟"

چەقەڵ گوتی: "ڕێوی ئازیز! من سەری لێدەرناکەم. بەخودای لە هەموو عەمرمدا تەنیا یەکجار مریشکەکەیم دزیوە. بزانە چ هاوارێکی بەرپا کردووەو دەڵێت:

"جوجەڵەکانم هەتیو کەوتوون، مریشکەکەم قەڵەو بوو، دە کیلۆ دەبوو و..."

ڕێوی بیرێکی بە مێشکدا هات و گوتی:

"ئەرێ جەنابی چەقەڵ! مریشکیش دە کیلۆ دەبێ؟ ناکا پیرەژن درۆ بکات! کوا با بەدەست هەڵی بسەنگێنم، لەوەیە دە کیلۆ نەبێت".

چەقەڵ گوتی: "ڕێوی ئازیز! بەڕاستی ئەقڵت باش کار دەکات. تۆ تەماشای من کە خەریك بوو باوەڕ بە قسەی پیرەژەن بکەم. باشە، هەڵی بسەنگێنە بزانە چەندە؟"

ڕێوی مریشکەکەی لە چەقەڵ وەرگرت و لە ناو دەستیا هەڵی سوڕاندو خێرا ئەم دەست و ئەو دەستی پێکردو بە دەوری خۆیدا سوڕایەوە، بە جۆرێ کە چەقەڵە گێژ بوو، و ڕێوی ئەو هەلەی قۆستەوەو مریشکەکەی لوش کرد. چەقەڵی بێ ئەقڵ کە هێشتا نەیزانی بوو، پرسی: "ئێ ڕێوی ئازیز! سەنگی چەند بوو؟"

ڕێوی وەڵامی دایەوە:

"دۆستی ئازیز تا درەنگ نەبووە بڕۆ بە پیرەژن بڵێ ئەوەندە هات‌و هاوار مەکە. لە کوێ دە کیلۆ بوو؟ مرشکەکەی سکی یەکێکی وەکو منی تێر نەکرد!"

چەقەڵ تازە تێگەیی کە خاپێنراوە. لێ تازە کار لە کار ترازا بوو، ڕێوی بە کاوەخۆ ملی ڕێگەی گرت‌و گوتی:

"خودا حافیز، دەت بینمەوە!"

# مشکی چاو چنۆك

هەبوو نەبوو جوتیارێك هەبوو لە گوندێكدا دەژیا. ساڵانە گەنمی تۆو دەكردو بەروبومێكی زۆری دەدورییەوەو گەنمەكەی لە گونیان دەكردو لە پاڵ ماڵەكەیدا دای دەنا.

رۆژێ لە رۆژان، دوو مشك لە نزیكی گونییە گەنمەكان لانەیەكیان بۆ خۆ دروست كردو گونییەكانیان كون كردو گەنمیان بۆ لانەكەیان كێشایەوە. تا ماوەیەك درێژەیان بەم كارەدا. دوای چەند رۆژێك، یەكێك لە مشكەكان گوتی:

"دۆستی ئازیز! ئیدی بەسە، هێندەمان گەنم هێناوەتە ژووری، تا كۆتایی زستان بەشمان دەكات. دوای زستانیش بیری دەكەینەوە"

لێ دۆستەكەی گوتی: "نە ء، كە چەند گونییە گەنمێكمان پەیدا كردووە، نابێ ئەم دەرفەتە لە دەست بدەین. دەبێ هەموو گەنمەكە بەرین تاكو تاكۆتایی تەمەنمان خواردنمان هەبێ"

مشكەكەی دی گوتی: "هەڵە مەكە. هەموو شتێك سنووری خۆی هەیە. ئەوانەی لەو سنوورە دەردەچن، هەمیشە سەریان لەبەرد دەدا. ئەگەر تاقە جارێك جووتیارە پێمان بزانێ فەوتو فەنامان دەكات"

- مەترسە هاوڕێ! ئەگەر جووتیارەكە پێی زانین، سوكێ لە كونەكەی تری لانەكەمانەوە دەردەفرتێین. خەم مەخۆ.
- ئەمە كارێكی گەوجانەیە. ئەگەر واز ناهێنی. من دەڕۆم.

چووە لانەكەوەو لە سوچێكدا خەوت. ئەو مشكەی لە دەرێی لانەكە بوو, تا توانی گەنمی بردە ناو لانەكەیانو هەر چاوی تێر نەدەبوو. رۆژێك جووتیارەكە بەر لەوەی بۆ مەزراكەی بڕوات، لێبڕا چاوێك بە گونییە گەنمەكاندا بخشێنێو ڕێكیان بخاتەوە. كە گەییە نزیكی گونییەكان بینی هەموویان كون كون بوون. جووتیارە حاڵی بوو كە كار، كاری مشكەو لە تەنیشتی گونییە گەنمەكانەوە تەڵەیەكی نایەوە.

رۆژێك مشكە چاو چنۆكەكە دووبارە هات تا گەنم ببات لە پڕ بوو بە تەڵەكەوەو مرد. بەڵام مشكەكەی دی كە قەناعەتی كردبوو، بە ساغی مایەوە.

# ڕێوی ناو بیر

هەبوو نەبوو ڕێویەك هەبوو لە بیابانێکی وشكو برینگدا دەژیا. ڕۆژێ مام ڕێوی بە دووی خواردندا دەگەڕا کە لەپڕ کەوتە بیرێکەوە. لەناو بیرەکەدا جگە لە بەردێکی سپی درێژ چی دیکە نەبوو. لە ناچاریدا پشتی بە بەردەکەوەداو پاشان خەوت. چەند ڕۆژێك بوری. ڕۆژێ مام ڕێوی دەنگێکی لە دەرێی بیرەکەوە ژنەوت، باش گوێی هەڵخست، بۆی دەرکەوت کە ئەم دەنگە، دەنگی مەیمونە، خێرا فێڵێکی دۆزییەوەو هاواری کرد: "ئەهای گۆریلی ئازیز! وەرە ئێرە، سەرگەرمییەکم دۆزیوەتەوە!"

مەیمون گوێی لە دەنگی بوو، هاتە دیار بیرەکەو ڕێوییەکەی لە بنی بیرەکەدا بینیو گوتی: "ئەوە چ دەکەی لەوێندەر؟ چ سەرگەرمییەکت دۆزیوەتەوە؟".

ڕێوی بەردە چەرمووەکەی نیشانداو گوتی: "دوگێکی سپی گەورەم دۆزیوەتەوە. چەندی لێ دەخۆم تەواو نابێ. ئای کە بەلەزەتە! ئەگەر برسیتە وەرە پێکەوە بخۆین"

مەیمون گوتی: "ڕێوی! ناچێتە ئەقڵمەوە. باوەڕناکەم دوگێك پەیدا بێ کە تۆ میوانی بۆ دەعوەت بکەی"

– بەلام ئەو دوگانەی لێرەن یەكو دووان نین. ئێرە پڕە لە دوگی مەڕان. من کە ژەمێکم خواردووە، حەز دەکەم تۆش سکێ تێر بکەی".

ڕێوی لە بری ئەوەی بیر لە هاتنە دەرەوە بکات، دەیویست ئەوانی دیکەش وەکو خۆی گیرۆدەبن. ئاخیرەکەی مەیمونی هەڵخەڵەتاندو مەیمون خۆی هەڵدایە بیرەکەوەو خێرا قەپی بە بەردەکەدا کردو ئەوسا بۆی دەرکەوت کە چ دوگێك ل گۆڕێ نەبووە. لەو ڕۆژە بە دواوە ئەو جووتە لە بیرەکەدا زیندانی بوون.

چەند ڕۆژێ دواتر، گورگێك کە لەو نزیکاوە ڕەت دەبوو، سەرو سەدای مەیمونو ڕێوییەکی ژنەوتو هاتە دیار بیرەکە. ڕێوی گورگەی بینیو هاواری کرد: "ئەهای گورگە! ئەگەر حەزت لێیە دوگ بخۆی وەرە خوارەوە. ئێمە هێندەمان خواردووە ناتوانین هەستین. تۆش وەرە باقییەکەی بخۆ، دەترسم ئەگەر ئەم دوگە زۆر بمێنێتەوە، خەراپ ببێ".

بەردە چەرمووەکەی بە گورگەکەش نیشاندا. گورگە هەر کە گوێی لە ڕێوی بوو، بەرەو بەردەکە خۆی هەڵدا. ویستی قەپێك بخوات لێ چەند ددانێکی شکاو هەنگێ بۆی دەرکەوت کە فریوی خواردووە. گورگەش ناچار بوو لە گۆشەیەکدا سەری خۆی کز بکات.

دوای چەند ڕۆژێك، هەموو پێکەوە بەرازێکیان خەڵەتاندو هێنایانە ناو بیرەکەوەو بەرازەکەش لە ناچاریدا لەوێندەر مایەوە. ئەوجا پڵنگیانیش بە هەمان دەرد بردو زۆریان کەیف بە کارەکەی خۆیان هات. بەم جۆرە، ڕێویو مەیمونو گورگو پڵنگو بەراز هەر پێنجیان لەناو بیرەکەدا مانەوە.

چەند رۆژێك بوری. هەموو برسییان بوو. سکیان کەوتە قوڕە قوڕ. ئاقیبەت رێوی تاقەتی چووو دیسان نەخشەیەکی داناو گوتی: "دۆستان! ئەگەر هەروا دانیشین، لە برساندا دەمرین. من پێشنیازێکم هەس"

هەموو گوتیان: "باشە، بیڵێ!"

رێوی گوتی: "دۆستان! گورگ خوازبێنی کەری ئێمەیە. رێوی شادی هێنی ئێمەیە. پڵنگ ، گەورەی ئێمەیە، بەرازیش هاوڕێمانە. بەڵام مەیمون، ئەحمەقی ئێمەیە. کەواتە باشتر وایە بیخۆین"

هەموو گوتیان: "بەڵێ دروستە، دروستە، وەرن با مەیمون بخۆین"

هەموو دەوری مەیمونیان گرتو کوشتیانو گۆشتەکەیان بەش کرد. چەند رۆژێکیان بەگۆشتی مەیمون بردە سەر.

ئەوجا دیسان برسی بوونەوە. دەبوو دیسان شتێ بخۆن.

رێوی گوتی: "دۆستان! پێشنیازێکم هەس"

هەموو گوتیان: "باشە بیڵێ، زوتر بیڵێ، خەریکە لە برسانا دەمرین"

رێوی گوتی: "پڵنگ گەورەی ئێمەیە، گورگیش خوازبێنیکەری ئێمەیە، رێویش شادی هێنە. هاوڕێشمانە ناوێ، کەواتە دەبێ بەراز بخۆین"

هەر کە ئەم قسەیە لە دەمی رێوی دەرهات، پڵنگ و گورگ پەلاماری بەرازیان داو کوشتیانو گۆشتەکەیان بەش کرد.

کەیەك دوو رۆژی دی بوری، دیسان برسی بوونەوەو داوایان لە رێوی کرد کە رێیەکیان نیشان بدات. رێوی گوتی: "پلنگ گەورەی ئێمەیە. رێوی شادی هێنی ئێمەیە، گورگیش خوازبێنی کەری ئێمەیە، ئێمەش کیژمان نییە تا گورگ بکەین بە زاوای خۆمانو دڵی تەنگی شاد بکەین. کەواتە باشتر وایە ئەو بخۆینو لە کۆڵی بکەینەوە"

پڵنگ دەمو دەست گورگەی کوشتو گۆشتەکەیان بەش کرد. ئێستا هەر رێویو پڵنگ مابوونەوە.

چەند رۆژێکی دی بوری. دیسان برسی بوونەوە. رێوی ریخۆڵەکانی بەرازی شاردبووەوەو هەر رۆژەی کەمێکی لێ دەخوارد. پڵنگی برسی رۆژێ رێوی بینی کە سەرگەرمی خواردنە، گوتی: "هێی رێوی! ئەوە چ دەخۆیت؟ بۆچی خولکێکی دۆستەکەت ناکەیت؟"

رێوی وەڵامی دایەوە: "پڵنگ گیان! من لە برسانا خەریکە ریخۆڵەکانی خۆم دەخۆم"

پڵنگ گوتی: "بەڕاستتە؟ کەواتە بۆ منیش ریخۆڵەی خۆم نەخۆم؟ بەڵام با بزانین چۆن دەستت بە ریخۆڵەکانت دەگات؟"

رێوی گوتی: "من ددانەکانم توند لە یەك سویو چەقۆیەکم بە ورگی خۆمدا کردو ریخۆڵەم دەرهێنا"

پڵنگ گوتی: "وای، من ناتوانم چەقۆ بە ورگی خۆمدا بکەم. تکات لێدەکەم تۆ ئەم کارەم بۆ بکە!"

**ڕێوی گوتی: "باشە، پێیدا دەکەم. بەڵام دەترسم توڕە ببی و پەلامارم بدەیت"**

**پڵنگ گوتی: "نە، دڵنیابە هیچت پیێ ناڵێم. ئەگەر باوەڕ ناکەی وەرە ئەم بەردە بخە سەر سەرم. ئەگەر تووڕە بووم هەقی خۆتە بەردەکە گوشار بدەی تا نەتوانم هەستم!"**

**ڕێوی دڵنیابوو و یەکسەر چەقۆیەکی بە ورگی پڵنگدا کردو پڵنگەش کوژراو ڕێوی خواردی. بەڵام ئیدی ڕێوی بە تەنیا مابووەوە. نە پڵنگێك بوو و نە گورگیێو نە....**

**ڕێوی قەت نەیدەتوانی بە تەنیێ لە بیرەکە بێتە دەریێو ڕۆژان بورین. چ کەسێك بەو ناوەدا نەهات و ڕێویش لە برساندا مرد.**

## ماری چل سەر

هەبوو نەبوو لە جێیەك دوو ماری گەورە هەبوون. یەكێك لە مارەكان چل سەرو یەك كلكو ئەوی دی چل كلك و یەك سەری هەبوو. ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاگر لە شوێنی مارەكان كەوتەوە. ماری یەك سەر هەڵات. لێ ماری چل سەر لە جێی خۆی نەبزووت. ماری یەك سەر لە كاتی ڕاكردنەكەدا ئاوڕی دایەوەو گوتی: "ئەهای هاوڕێ! بۆ وەستاوی؟ وەرە هەڵێین و خۆمان نەجات بدەین. دەنا لە ئاگرەكەدا دەسووتێین!"

ماری چل سەر كە نەیدەتوانی لە جێی خۆی بجوڵێ، وەڵامی دایەوە" ئەگەر بمتوانی بوایە تا ئێستا ڕامكردبوو. لێ بەداخەوە سەرەكانم پێكەوە ناسازێن! چەند سەرێكم دەیانەوێ بەرەو باشوورو چەند دانەیەكیان بەرەو ڕۆژهەڵات، چەند دانەیەكی دی بەرەو ڕۆژئاوا، چەند دانەیەكیش بەرەو باكوور بڕۆن. حەوت هەشت دانەشیان بەراكردن قاییل نین و دەڵێن ئاگرەكە بۆ خۆی دەسوتێ و تەواو دەبێ. بە كورتی ئەم سەرانە لە بەینی خۆیاندا ناكۆكن و منیش ناتوانم بۆ هیچ كوێیەك بڕۆم.

ماری یەك سەر كە گوێی لەو قسانە بوو، گوتی: "كەوایە! من ڕۆییشتم"

و لە ئاگرەكە دوور كەوتەوە. بەڵام ماری چل سەر نەگەییە هیچ ئەنجامێك و لەنێو ئاگرەكەدا مایەوەو سوتاو مرد.

## میوەی جادو ئامێزو وەزیری دڵڕەش

هـەبوو نـەبوو لـە زەمـانی کۆنـدا پاشـایەك هـەبوو، توتییـەکی هـەبوو دەیتـوانی پێشـبینی بکات. پاشا زۆری دڵ بەتوتییەکەی خۆش بوو، و خۆشی دەویست، بۆیە وەزیرەکەی بەغیلی پیێ دەهات.

رۆژیێ توتییەکە دەیویسـت لـە کۆشـك بچێتە دەرێو پیاسـە بکـات. توتییەکە مۆڵـەتی لـە پاشـا خواسـت وەزیـر یەکسـەر رەتـی کـردەوەو گـوتی: "ئەگـەر ئـەم توتییـە بـڕوات، ئیـدی ناگەڕێتەوە. درۆت لەگەڵدا دەکات. بڕوای پیێ مەکەو مەیەڵە بڕوات!"

پاشا کە متمانەی بەتوتییەکە هەبوو، گوتی: "من مۆڵەتی دەدەمیێ. بەڵام ئەگەر ئەم توتییە نەگەڕایەوە، پایەی پاشایەتییەکەم دەدەم بە تـۆ، ئەگـەر گەڕاشـەوە، تـۆ دەبیێ هەرچیت هەیـە بیدەیتە من!"

پاشا مۆڵەتی بە توتییەکەدا، تووتی لە شـەقەی باڵیداو رۆیـی. رۆژیێ بـوری‌و نەگەڕایـەوە. دووەم رۆژ، ناوکێکی بەدەمەوە بوو گەڕایـەوە.تـووتی ناوکەکـەی دا بـە پاشـاو گـوتی: "ئەگـەر ئـەم ناوەکە بچێنی، دەبیێ بـەمێوو هـەر پیرەمێردێك لەبـەری ئـەو مێـوە بخـوات، دەبێتـەوە بـە لاوێکی هەژدە ساڵە"

پاشا خۆشحاڵ بوو. زوو فرمانی دا کە ناوکەکە بڕوێنن. باغـەوانێکی پـیری دۆزییـەوە کـە ژنێکی پیری هەبوو. دەستووری دانیێ کە ئاگایان لە مێوەکەی بێو هەر کاتیێ بەریدا، دەتوانن نیوەی بەرەکەی بۆ خۆیان بچننەوەو بیخۆن‌و باقییەکەی بدەن بە پاشا.

پاشان پاشا، ئـەو مەرجـەی بیرکەوتـەوە کـە لەگـەڵ وەزیـردا کردبووی. پۆسـتی وەزارەت‌و سەروەت‌و سامانەکەی لیێ سەندەوەو لە کۆشك وەدەری نا. وەزیر زۆر توڕە بوو.

ئەو ناوکەی کە تووتییەکـە هێنـابووی، بـوو بـە درەختێکـی گـەورەو درەختـە دوو هێشـووە ترێـی گـرت. ترێیـەکان پـیێ گـەیین. باغـەوان یـەکێکیانی بـۆ خـۆی هـەڵگرت‌و ئـەوی دیکـەیانی کردەوە تا بیدات بە پاشا. لەگەڵ ژنەکەیدا بەرەو کۆشکی پاشا وەڕیێ کەوتن. لە رێگەدا..

وەزیری جاران پێشی گرت‌و گوتی: "بۆ کویێ دەچیت؟"

باخـەوان گـوتی: "ئـەو ناوکـەی پاشـا دایمـیێ، بـوو بـە درەخـت‌و درەختـە ترێـی گـرت‌و ئێستایەکێك لەو هێشوە ترێیانە بۆ پاشا دەبەین"

وەزیر گوتی: "ئاوها! با منیش ببینم بزانم ئەم ترێیە چۆنە؟!"

باخەوان دایە دەستی وەزیر. وەزیر کە پێشتر دەستی خۆی ژەهراوی کردبوو، ترێیەکەی ئـاڵودە کـردو دایـەوە دەسـتی باخەوانەکـەو باخـەوان‌و ژنەکـەی میوەکـەیان بـردو پێشکەشـی پاشایان کردو گەڕانەوە بۆ باخەکە.

پاشا خەریك بوو ترێیەکە بخوات کە کۆنە وەزیر هات بە سـەرداو گـوتی: "پاشـای گـەورە! هاتووم بزانم ئەو میوەیەی کە تووتییەکەت باسی دەکرد چ کاریگەرییەکی هەیە".

پاشا گوتی: "کارێکی چاکت کرد، من ئێستا دەمەوێ میوەکە بخۆم"

وەزیر گوتی: "بمبوورە عەرزێکم هەیە. ئایا باشتر نییە بەر لە خواردن، ئەم ترێیە تاقی بکەیتەوە؟ ئاخر تا ئێستا کەس لێی نەخواردووە لەوەیە میوەیەکی باش نەبێ!"

پاشا کە قسەکەی وەزیری ژنەوت، گومانی پەیدا کرد و چەند بۆڵێکی لە هێشووە ترێیەکە دەرخواردی سەگێکدا، سەگەکە دوای خواردنی، دەستبەجێ گیانی دەرچوو. وەزیر گوتی: "دەبینی، دەبینی تووتییەکەت دەیویست چ بەڵایەکت بەسەرا بێنێ؟

وەزیر داوای لە پاشا کرد کە تووتییەکە بکوژێت، پاشا باوەڕی بە قسەکانی وەزیر کردو بەر لە هەر شتێك دەستووریدا کە باخەوانەکەو ژنەکەی بگرن و بیانهێنن.

سەربازان هاتنە باخەکەوە، لێ هەر چەند گەڕان چ خەبەرێك لە باخەوان و ژنەکەی نەبوو، گەیینە ژێر درەختی ئەنگورەکەو چاویان بە کچ و کوڕێکی هەژدە ساڵان کەوت کە لە بن دار مێوەکەدا دانیشتبوون. سەربازەکان لێیان پرسین: "ئەرێ پیرەمێردو پیرەژنە باخەوانەکان لە کوێن؟"

کچەو کوڕە وەڵامیان دایەوە: "ئەوەتان لە بەردەمی ئێوەدا وەستاون، ئێمەین!"

ماموران گوتیان: "بەڵام پاشا باخەوانە هەفتا ساڵەو پیرەکانی ئەم باخەی دەوێ، ئێمە کارمان بە ئێوەی گەنج نییە"

سەربازەکان گەڕانەوە لای پاشاو چییان دیتبوو ژنەوتبوو، بۆیان گێڕایەوە. پاشا دەستووریدا: "بڕۆن ئەو کچ و کوڕە گەنجانە بێنن".

سەربازان ڕۆییشتن و ئەو دووەیان هێنا. پاشا پرسی: "ئێوە بە ئیزنی کێ چوونەتە ئەو باخەوە؟ ئەدی باخەوانەکانی من لە کوێندەرن؟"

وەڵامیان دایەوە: "ئەی پاشا! ئێمە هەمان پیرەژن و پیرەمێردی باخەوانی جەنابتین! ڕاستیەکەی بیستمان کە دەستووری کوشتنی ئێمەت داوە، بۆیە بڕیارماندا هێشوە ترێیەکە بخۆین و بمرین، نەك لەبەر چاوی خەڵکی دا لە گەردنمان بدرێ، هێشوە ترێیەکەمان خوارد، بەڵام نەك هەر نەمردین، بەڵکو بووینەوە بە هەژدە ساڵان. ئێستا داوای لێبوردن لە ئێوە دەکەین. ئێمە هەمان پیرە هەفتا ساڵانەکەین"

پاشا زۆری سەیر پێ هات و زانی ئەم ماستە مویەکی تێدایەو کەسێك لەم بەینەدا نیازی خراپی هەیە. پاشا پرسی: "بەر لەوەی مێوەکە بدەنە من، ئایا کەسێك دەستی تێوە نەدا؟"

بە جووتە وەڵامیان دایەوە: "کاتێ کە ئەنگورەکەمان بۆ لای تۆ دەهێنا، کۆنە وەزیرەکەی جەنابت هاتە سەر ڕێگەمان و ترێیەکەی لە دەستمان وەرگرت و هەندێ تەماشای کردو ئەوسا دایەوە پێمان"

پاشا گوتی: "ئاوها! ئێستا هەموو شتێك حاڵی بووم. هەموو ئەم بەزم و بەڵایە لە ژێر سەری وەزیر دایە"

و دەستووری کوشتنی وەزیری حیلەبازو دڵڕەشیدا.

## گۆزەی رۆن

هەبوو نەبوو، ریوییەك هەبوو، رۆژێك لە سارایەكدا دەگەڕا، لە پڕ چاوی بە گورگێك كەوتو بەخۆی گوت: "قەت بە بیرمدا نەدەهات جگە لە من لەم سارایەدا چ حەیوانێكی دی هەبیٚ"

بەرەو لای گورگە چوو و گوتی: ئەی گورگی ئازیز! وەرە با ببینە هاوڕیٚ"

و بوون بە دۆستو هاوڕیٚ. بە جووتە دەگەڕان كە لە پڕ گۆزەیەك رۆنیان دۆزییەوە. گورگ گوتی: "هێی ریوی! وەرە ئەم رۆنە پێكەوە بخۆین"
ریوی گوتی: "نە، كەمیٚ سەبر بكە، با گۆزە رۆنێكی دیكەش بدۆزینەوە، ئەوجا بیخۆین"

گورگە قاییل بوو. ئەو گۆزە رۆنەیان لە شوێنیٚ داناو دیسان كەوتنە گەڕان لە گۆزەیەكی دیكە. ماوەیەك لەم لاو لەولا سوڕانەوە. لەم ماوەیەدا ریوی هەر بیری لەلای گۆزە رۆنەكە بوو، تا فرسەتی هێناو بە دزی لە گورگە جیا بووەوەو رۆیی و هەندیٚ لە رۆنی گۆزەكەی خوارد.
دوای ماوەیەك گورگە هیلاك و ماندوو پەیدا بوو. ریوی پرسی: "گۆزەیەكت دۆزییەوە؟"

گورگ گوتی: "نەخێر نەم دۆزییەوە، ئەدی تۆ؟"

ریوی كە سەرتوێژی رۆنەكەی خواردبوو، وەڵامی دایەوە: "نا، گورگی ئازیز! منیش هیچم بە دەست نەهێنا. بەڵام لە گوندی یەكێك بەناوی (سەرخان) خێری دەكرد. چوومە ئەوێندەرو سكی خۆم تێركردو گەڕامەوە"

رۆژی دواتر، گورگو ریوی، بیٚ ئەوەی رۆنەكەی پێشوو بخۆن، دووبارە رۆییشتن بە دووی گۆزە رۆندا. ریوی كە بینی گورگە ئاگای لیٚ نییەو دوورە گەڕایەوەو نیوەی رۆنی گۆزەكەی خوارد. دوای تۆزێك گورگە هاتەوەو گوتی: "گۆزەیەكت پەیدا نەكرد؟"

ریوی كە رۆنەكەی نیوە كرد بوو، گوتی: "نا، گورگی ئازیز! منیش وەكو تۆ بە دەستی تاڵ گەڕامەوە. لیٚ لە گوندیدا دەولەمەندێك بە ناوی (نیوخان) خواردنی نەرزی دەبەشییەوە، چووم‌و خواردنم خواردو گەڕامەوە"

رۆژی دواتر دیسان چوونەوە لە گۆزە رۆن بگەڕێن. ریوی دیسان بەر لە گورگە گەڕایەوەو هەموو رۆنەكەی خواردو بنی گۆزەكەشی لیستەوەو خۆی مڕ كرد. كە گورگە گەڕایەوە، ریوی لیٚی پرسی: "گورگی ئازیزْ شتێكت پەیدا نەكرد؟"

گورگ وەڵامی دایەوە: "نەخێر، ئەدی تۆ؟"

ریوی كە هەموو رۆنی گۆزەكەی خواردبوو، گوتی: "منیش هیچم پەیدا نەكرد، بەڵام لە گوندیدا (بن خان) زەماوەندی هەبوو، لەویٚ نانێكم خواردو گەڕامەوە"

گورگ گوتی: "ئەی ریوی ئێمە هێندە بە دوای گۆزە رۆندا گەڕاین، بە هیلاك چووین. جاریٚ ئەو گۆزەیەی كە هەمانە بێنە تا رۆنیٚ بخۆین، ئەگەر ویستت ئەوسا بەدوای گۆزەیەكی دیدا دەگەڕێین"

**ڕێوی هەوەڵجار ویستی گورگەکە فریو بدات، لێ ئەم کارە فایدەی نەبوو. گورگی برسی زوو دەرکی گۆزەکەی کردەوەو بینی کە گۆزەکە بە تاڵی بە تاڵە. گورگە توڕە بوو و گوتی: "تۆ ڕۆنەکەت خواردووە؟"**

**ڕێوی گوتی: "چی؟ من خواردوومە؟ بزانە کاکی گورگ! بێگومان خۆت هەموویت خواردووەو دەیخەیە ئەستۆی من."**

**گورگ گوتی: "نە، من دەمم تێوە نەداوە. تۆ خواردووتە"**

**و هەڕەشەی لە ڕێوی کردو هاواری کرد.**

**ڕێوی گوتی: "هاوار هاوار مەکە. من نەمخواردووە، بێگومان تۆ خواردووتە"**

**گورگەکە زیاتر توڕە بوو و گوتی: "جگە لە تۆ کێ دەتوانێ بیخوات؟ ئێستا دەزانم تۆ ئەوسای سەرتوێژی ڕۆنەکەت خوارد، گوتت: "سەرخان نەزری دابەش دەکرد، کە نیوەی گۆزەکەت خوارد، گوتت نیوخان خێری کردبوو و کاتێ کە ڕۆنەکەت تا بنی گۆزەکە خوارد، گوتت، بن خان زەماوەندی هەبوو، من ئەوسا لە مەبەستت تێ نەگەییم، لێ ئێستا دەزانم چ کڵاوێکت لەسەر ناوم!"**

**و دەستی ڕێوی گرت.**

**ڕێوی گوتی: "گورگی ئازیز! ئەوەندە هاتوهاوار مەکە. وەرە هەردووکمان لەبەر هەتاوەکە بنووین، هەنگێ هەر کەسێك ڕۆنەکەی خواردبێ بێگومان سکی دەبریقێتەوەو خێرا خەتابار بەدەردەکەوێ"**

**گورگە قاییل بوو و هەردووکیان لەبەر هەتاوەکە ڕاکشان. پاش تۆزێ، گورگە خەوی لێکەوت. بەڵام ڕێوی نەخەوت و ئەو تۆزە ڕۆنەی، کە بەبن و قەدی گۆزەکەوە مابوو، دەرهێناو ماڵی بە سکی گورگەداو بەر لەوەی شوێنەواری ڕۆنەکە بچێتەوە، گورگەی بێدار کردەوەو گوتی: "ئەهای گورگ! تەماشاکە! بزانە سکت ڕۆناوییەو دەبریقێتەوە. ئێستا دەرکەوت کە کێ ڕۆنەکەی خواردووە!"**

**گورگە حەپەساو سەری سوڕما..**

# گۆڵنار

هەبوو نەبوو، لە زەمانی کۆندا پاشایەك هەبوو سیٚ کوڕی هەبوو. پاشا رۆژێك سەرو تیرو کەوانی دانە دەستو گوتی: "هەر یەك تیریٚ بهاویٚ. تیری هەر کەسە کەوتە هەر ماڵێکەوە کچی ئەو ماڵەی بۆ دەخوازم!"

تیری کوڕی گەورە، کەوتە ماڵی وەزیرەوە. بۆیە کچی وەزیریان بۆ خواست. تیری کوڕی ناوەنجی کەوتە ماڵی قازییەوەو کچی قازییان لیٚ مارەکرد. تیری کوڕە بچووك بە جوریٚ دەرچوو کە شارو گوندانی بڕیو بەرەو دەشتو دەران رۆی. دوای تیرەکە کەوتن و دیتیان تیرەکە کەوتۆتە ناو بێشەیەكو ها وەدەست مەیمونێکەوەو سەرگەرمی جوینێتی. بۆیە لێبڕان کە مەیمونەکە لە کوڕی بچووکی پاشا مارە بڕنو وایان کرد.

برا گەورەکان، گاڵتەیان بە برا بچووکەکەیان دەکرد کە مەیمونی خواستبوو. رۆژێك برا گەورەکان پێیان گوت: "ئێمە دەمانەویٚ هەریەکەمان بە بۆنەی ژن هێنانمانەوە میوانداررییەك رێك بخەینو بابمان دەعوەت بکەین."

برا بچووك بەم قسەیە غەمگین بوو، چونکە دەبوایە ئەویش میوانداریییەك بکات، بەلاَم ژنەکەی ئەو کە مەیمون بوو، نەیتوانی چێشت لیٚ بنیٚو پێشوازی میوان بکات. برا بچووك هاتە لای مەیمونەو گوتی: "برایەکانم بابم بۆ ماڵی خۆ دەعوەت دەکەن، ئێمەش دەبیٚ کارێك بکەین"

مەیمون وەلاَمی دایەوە: "بە بابتو دەستو پێوەندەکەی بڵیٚ با بێنە پشتی کێوی تا لەوێندەر پێشوازییان بکەم!"

برا بچووك رۆییو ئەم قسانەی بە پاشاو هاونشینەکانی گوت: باوك هەر کە گوێی لە ناوی پشتی کێو بوو، توڕە بوو و دەعوەتەکەی رەفز کرد. بەلاَم کوڕی بچووك هاونشینانی بابیو دوو براکەی بردن بۆ ئەوێندەر. لە بناری کێودا، بۆ بەستنەوەی هەوساری هەر ئەسپێك، کۆڵەیەکی زێڕ داچەقێنرا بوو، و بۆ هەر میوانێك خواردنی جۆربە جۆرو بەتامیان لە قاپی زێڕ کردبوو. پیاوان دانیشتنو نانیان خواردو لەزەتیان بردو ئەوجا هەستان. ئەوسا کوڕی بچووك هاواری کرد: "ئەی میوانانی ئازیز! هەر کەسەو قاپە زێڕەکەی بەردەمیو ئەو کۆڵەکە زێڕەی ئەسپەکەی پێوە بەسترابوو هەڵگریٚو بۆ خۆی بیبات، ئەمە دیاری ئێمەیە بۆ ئێوە"!

برا گەورەکان بەغیلییان پیٚ بردو بە یەکتریان گوت: "دەبیٚ بە بابمان بڵێین کە بوکەکانی دەعوەت بکاو میوانداریییان بکات. ئەوسا برا بچووکەکەمان مەجبور دەبیٚ پەتیٚ بکاتە ملی مەیمونەو بەدوای خۆیدا رای بکێشێت. ئێمەش لەسەر رێگە، سەگ بەر دەدەینە گیانی مەیمونەکە تا هەرایەك بەرپا ببیٚ!"

دوای چەند ڕۆژێك، پاشا کوڕو بووکەکانی بۆ میوانی دەعوت کرد. کوڕی بچووك چووە لای ژنەکەی و گوتی: "بابمان دەعوتی کردووین، ئێستا چی بکەین؟"

مەیمون وەڵامی دایەوە: "بڕۆ بۆ پشتی هەمان کێوی کە میوانەکانت بۆ برد بوو و هاوار بکە گوڵنار! ئەوسا گرفتی تۆ چارەسەر دەبیٚ"

کوڕی پاشا ڕۆیی و بانگی کرد: "گوڵنار!"

لەپڕ پەرییەك بە هەڵبەز و دابەزەوە لە نێو کێوەکەوە هاتە دەریٚ. کوڕی پاشا کە بینی لە هۆش خۆی چوو. دوای تۆزێك بە هۆش هاتەوە. پەرییەکە کە بەدیارییەوە دانیشتبوو، گوتی: "من ژنی تۆم، گوڵنارم"

ئەوجا پێستی مەیمونەکەی، کە بە دەستەوە بوو، دایی و گوتی: "وەرە با بچینە میوانی، بەڵام ئاگاداربە کەس ئەم پێستە نەدزیٚ، ئەگەر بیدزن، ئیدی تۆ ناتوانی هەرگیز من بدینی"

کوڕی پاشا گوتی: "باشە، ئاگادارم"

بەرەو کۆشك ڕۆییشتن، برا گەورەکان کە ئەو جووتەیان بەو حاڵەوە بینی هێندە سەریان سوڕما کە هۆش لە کەللەیان نەماو بە گوێی یەکتریاندا چپاند: "ئەمجارەش خۆی دەرباز کرد. ئێستاچ بکەین؟"

برا گەورەکەیان گوتی: "پێت وایە رازێك لە پێستی مەیمونەکەدا نەبیٚ، پێویستە برا بچووکەکەمان سەرگەرم بکەین و فریوی بدەین و ئەوجا پێستە مەیمونەکە بدزین"

برا بچووکەکەیان فریوداو پێستە مەیمونەکەیان لە دەستی سەندو خستیانە ئاگرەوەو سوتاندیان.

دەنگێکی ترسناك لە پێستەکە بەرز بووەوە. کوڕی بچوك بە ژنەوتنی ئەم دەنگە وەئاگا هات و پێستەکەی بینی. ویستی لە ناو ئاگرەکە دەری بێنیٚ، بەڵام پێستەکە زوو بوو بە خۆڵەمێش و لە بەین چوو و برا بچووکەکە ئیدی نەیتوانی گوڵنار بدینیٚ و بەختەوەری خۆی لە دەستدا.

سەرچاوە:
داستان هاو ئەفسانەهای ترکیە
مترجم: شهین دخت رئیس زادە
چاپ سوم: 1382

## حەمە كەریم عارف

- كەركووكییە و لە ساڵی 1951دا لەدایك بووە.
- لە ساڵی 1975 كۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو كردووە.
- یەكەم بەرهەمی شیعرێكە بەناوی (هەڵبەستێكی هەتیو كەوتوو) كە لە ژمارە (170) رۆژنامەی هاوكاری ساڵی 1973 بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی 1976ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەكاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سكرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوكراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی كەركووك, نووسەری كوردستان, كەلتوور, نووسەری كورد, گوڵانی عەرەبی, ئاڵای ئازادی تا ژمارە 00222, گۆڤاری نەوشەفەق.
- جگە لە ناوی خۆی, بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی كەركووك, نووسەری كوردستان, كەلتوور, رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: 222 بەناوی گۆڤەند, زنار, سیپان, پاكزاد, محەمەدی حاجی, سیروان عەلی, دیدار هەمەوەندی, هێژا, ح. ع بەرهەمی بڵاو كردۆتەوە.
- جگە لە پارتی دیموكراتی كوردستان و یەكێتیی قوتابیانی كوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و رێكخراوێكی سیاسی نەبووە, لە ساڵی 1974 – 1975دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە, لە هەشتاكاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ, بێ وابەستەگی حیزبی, پێشمەرگە بووە و وەكو بەشدارییەكی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی كوردا شانازی پێوە دەكات و منەت بەسەر كەسدا ناكات, چونكە باوەڕی وایە كە رۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحكومە بە پێشمەرگایەتی.
- لە هەشتاكانەوە تا ئێستا راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆكایەتی لقی كەركووكی یەكێتیی نووسەرانی كوردی كردووە.
- زۆر بەرهەم و كتێبی چاپ و بڵاو كردۆتەوە, لێ زۆربەی هەرە زۆریان, بە تایبەتی ئەوانە لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە كەم بڵاو بوونەتەوە, لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە كە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

1- تیرۆژ, كۆ چیرۆك, چاپی یەكەم 1979
2- كۆچی سوور, رۆمان, چاپی یەكەم 1988
3- بەیداخ, چیرۆك, 1988
4- داوەتی كۆچەرییان, كۆ چیرۆك چاپی دووەم 2005
5- لە خۆ بێگانە بوون, كۆمەڵە چیرۆك, چاپی یەكەم (1999) دەزگای گوڵان
6- كوچ سرخ, كۆ چیرۆك, بە فارسی, وەرگێران چاپی یەكەم 1987 شاخ
7- نینا, رۆمان, سابت رەحمان, دوو چاپ, شاخ, شار 2002
8- نامۆ, رۆمان, ئەلبیر كامۆ, دوو چاپ, شاخ, شار 2003 دەزگای ئاراس
9- رێبەر, رۆمان, مەهدی حسین, یەك چاپ (شاخ)
10- شكست, رۆمان, ئەلكساندەر فەدایەف, چاپی شاخ (راه كارگر)
11 – هاوماڵەكان, رۆمان, ئەحمەد مەحمود, دوو چاپ, شاخ, شار 2000 گوڵان

12- بێناسنامەکان, رۆمان, عەزیز نەسین, 3 چاپ شاخ, شار 2003

13- قوربانی, رۆمان, هیرب میدۆ, چاپی یەکەم 2004 دەزگای شەفەق

14- دووره ولات, رۆمان ع. ڤاسموف, چاپی یەکەم2000 دەزگای گولان

15- ئازادی یا مەرگ, رۆمان, کازانتزاکیس, چاپی یەکەم 2003 کتێبخانەی سۆران

16- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی, دوو چاپ, شاخ, شار 2004 کتێبخانەی سۆران هەولێر

17- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی, چاپی شاخ 1985

18- دلێریی خۆراگرتن, ئەشرەف دەهڤانی, چاپی شاخ

19- مەسەلەی کورد لە عێراقدا, عزیز شەریف

20- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد, ئیحسان نوری پاشا, یەك چاپ

21- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ, مەسعودی ئەحمەد زادە, چاپی شاخ

22- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو, د. کوینتەر دیشنەر, چاپی شێیەم 2004 دەزگای ئاراس

23- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس, نەجەف قولی پسییان

24- گوزارشتی مۆسیقا, د. فوئاد زەکەریا.

25- دەربارەی شیعر و شاعیری, رەزا بەراهەنی.

26- ڤنسنت ڤان گوگ, شانۆنامە, باول ئایز لەر

27- بە دوعا شاعیرەکان, شانۆنامە, جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:12)

28- جولەکەکەی مالْتا, شانۆنامە, مالرۆ.

29- دادپەروەران, شانۆنامە, ئەلبیر کامۆ.

30-بەد حالْی بوون, شانۆنامە, ئەلبیر کامۆ.

31- چاو بە چاو, شانۆنامە, گەوهەر مراد (غولام حسەینی ساعیدی)

32- ریچاردی سێیەم, شانۆنامە, شەکسپیر.

33- گەمەی پاشا و وەزیر, شانۆنامە, عەبدوڵلائەلبوسێری.

34- کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا, چاپی یەکەم 1998 وەزارەتی رۆشنبیری.

35- هونەر و ژیانی کۆمەلایەتی, پلیخانۆڤ, چاپی یەکەم 2005 دەزگای موکریانی

36- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت, ئیڤلین رێید.

37- لێکدانەوەیەك لە مەڕ نامۆ, لویس ریی.

38- منداڵە دارینە, چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.

39- فاشیزم چیی؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان, یەلماز گونای

40- شوانە بچکۆلەکە, چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان

41- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ منالان)

42- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە.

43- کۆمەڵێك ئەفسانەی جیهانی (23 ئەفسانە)

44- زندە خەون, کۆمەڵە چیرۆکی چیخوف, چاپی یەکەم (2001) دەزگای موکریانی

45- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی, چاپی یەکەم (2004) کتێبخانەی سۆران, هەولێر

46- جێ پێ, کۆمەڵێك چیرۆکی فارسی چیرۆکنووسان:(سادقی هیدایەت, جەلال ئال ئەحمەد, بوزرگی عەلەوی, سادقی چوبەك, مەنسوری یاقوتی)

47- چیرۆکستان, کۆمەڵێك دەق و رەخنە, چاپی یەکەم 2005 نووسەرانی کەرکووك

48- چۆنیەتی فێر بوونی زمانی فارسی, چاپی یەکەم (2000) حەمە کەریم عارف

49- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی – کوردی) حەمە کەریم عارف

50- پەلکە رەنگینە, حەمە کەریم عارف, چاپی یەکەم (2004) وەزارەتی رۆشنبیری

51- کۆمەڵێك چیرۆکی بێگانە

52- چزیشفسکی, فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس

53- چایکۆ فسکی, ژیان و بەرهەمی.

54- ئیدگار ئالین پۆ, ژیان و بەرهەمی.

55- جاك لەندەن, ژیان و بەرهەمی

56- گوگول, نووسەری ریالیست

57- یەڵماز گونای, ژیان و بەرهەمی

58- سادقی هیدایەت, ژیان و بەرهەمی

59- خافرو غ لە شیعر دەدوێ, ژیان و بەرهەمی

60- رێبازە هونەرییەکانی جیهان

61- ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیات دا, چاپی یەکەم (2004) دەزگای سپیرێز

62- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا ( بە شەریکی) چاپی یەکەم (2001) دەزگای گوڵان

63- راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا, حەمە کەریم عارف

64- دیدار و دەق و رەخنە.

65- دیداری چیرۆکڤانی.

66- قوتابخانە ئەدەبییەکان, رەزا سەید حسەینی.

67- ناودارانی ئەدەب, حەمە کەریم عارف

68- هەزار تۆپی شیعری نوێخوازی و چەند باسێکی دی, حەمە کەریم عارف.

69- کورد لە سەدەی نۆزدە و بیست دا, کریس کۆچرا, چاپی یەکەم 2003 کتێبخانەی سۆران

* لە راپەڕینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات و بەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاو دەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن, ئامادەیە بە خۆڕایی پێشکەشیان بکات و...